یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

# بڕیار

10

ساڵی یەکەم - نازاری 2009

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan



## با برینەکان ساڕێژکەین!!

## کارگێڕی یا بەڕێوەبردن؟

## چۆن ڕێکخراوەکەت بەرەو پێش دەبەیت؟

## نامەی دایکێکی دڵشکاو!

## پێڵاوەکانی میری میهرەبان!

The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan

# بریار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی – ساڵی یەکەم – ژمارە 10 - ئازار 2009

























**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

عادل محەمەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

07705033131

**پەیوەندییەکان**

محەمەد هاشم

**بازاڕسازی**

بەرزان ئەبوبەکر

**دیزاین**

جەمال دەروێش

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم تەلاری سلێمانی مۆڵ نهۆمی دووەم

بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە

3193946

E-mail: bryarmagazin@gmail.com

هەولێر- گەڕەکی زانکۆ - 99

بەرامبەر ئامادەیی محەمەد ماجدی

07504463230 07504288901

0662559165

**تیراژ: ٣٠٠٠ دانە**

چاپخانەی سەردەم

**بۆ پەیوەندیکردن بە بریارەوە**

کەرکوک: ٠٧٧٠٨٥٦٣٧٢٤ هەڵەبجە: ٠٧٧٠١٩٣٣٩٦٧ ڕانیە: ٠٧٧٠٢٢٩٣٦٢٨

دەربەندیخان: ٠٧٧٠١٥٨١٠١٨ کفری: ٠٧٧٠١٥٦٦٨٧٦ کەلار: ٠٧٧٠٢١٠١٢٨٨

چەمچەماڵ: ٠٧٧٠٨٥٥٠٥٨٦ کۆیە: ٠٧٧٠١٥٤٩٧١٤ سۆران: ٠٧٥٠٤٥٠١٩٣٣

چۆمان: ٠٧٥٠٤٥٦٧٩٩٢ قەڵادزێ: ٠٧٧٠١٥٨٥٢٠١

ئەی خۆشەویستی هەژاران و بێنەوایان

دوای تۆ کێ فرمێسکەکانمان بسڕێت؟

پایەداربێت یادی لەدایکبوونی پێغەمبەری مرۆڤایەتی

پێشەوای ئاشتی و خۆشەویستی و میهرەبانی

موحەممەد «دروودی خودای لەسەربێت»

## یەکەم دڵۆپ



سەرنووسەر

# با برینەکانمان سارێژ کەین!!

ئێمەی میللەتی کورد چەندین ساڵە لە نەهامەتی و ماڵوێرانی و ئەشکەنجەو ئازاردا دەژین، دوژمنەکانمان هونەریان نواندووە لە دژایەتی کردنی خواست و هیواو ئاواتی گەلدا.

چەندین ساڵ ئەم کوردستانە مەحروم بوو لە ڕەوتی پێشکەوتن و گەشەپێدان و هەنگاونان بەرەو ژیارو شارستانیەت و گەیشتن بە گەلانی جیهان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

چەندین ساڵ بوو، رووحی داهێنان و وزەی نوێکاری لە ناخی نەوەکاندا زیندە بە چاڵ دەکراو ڕێگە نەدەدرا بە بنیاتنانی سیستەمی پێشکەوتن و دامەزراندنی پرۆژە شارستانی و پیشەسازی و کشتوکاڵی و خزمەتگوزارییەکان، تا ئەم گەلە لە نێو گەلانی جیهاندا پێگەیەك بۆ خۆی دروست نەکات.

ئەمڕۆ دوای ئەوەی (١٨) ساڵە ئەو هەورە ڕەشە لە ئاسمانی ئەم وڵاتە شیرینەدا ڕەویوەتەوەو بەربەستەکان شکێنران و وڵاتەکەمان کەوتەوە دەستی خۆمان.

کاتی ئەوە نەهاتووە چی دی باس لە ڕابردوو نەکەین و کارەکانمان بەرنامە ڕێژ بکەین و لە ئێستادا بژین و لەگەڵ هەموو ڕۆژێکی نوێدا دەست بە کارە نوێیەکانمان بکەین؟!

کاتی ئەوە نەهاتووە چی دی بەردەوام ناتەواوی و کەمتەرخەمییەکانی خۆمان نەخەینە ئەستۆی دوژمنەکانمان و هەر شیوەن بۆ ڕابوردوو نەکەین؟!

کاتی ئەوە نەهاتووە لەبری ئەوەی لە بۆنەکانی ئەنفال و هەڵەبجەو کیمیاباراندا برینەکان بکولێنینەوەو کۆڕی ماتەم و خەمباری و ماڵوێرانیان بۆ نوێ بکەینەوە، هەوڵی سارێژکردنی برینەکان بدەین و فرمێسکەکان بسڕین!

باشتر وانییە لە خۆمان بپرسین چیمان بۆ ئەو هەموو خێزانە بریندارو ئەنفالکراوو ماڵوێرانە کردووە؟!

کاتی ئەوە نەهاتووە دوای (١٨) ساڵ ئازادی لە خۆمان بپرسین: لەو ماوەیەدا چیمان کردووە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی یاساو کۆمەڵگای شارستانیەت و مۆدێرن و پێشکەوتوو!!

لەم ماوەیەدا چەند کارگەمان دامەزراند، چەند پرۆژەی پیشەسازی و کشتوکاڵی و بازرگانیمان بنیاتناوە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ژیارو شارستانیەتی ئەم وڵاتە؟!!

لەسەر ئاستی نەتەوایەتی چی کرا بۆ پاراستنی زمان و کەلتورو کەلەپورو تایبەتمەندی و موقەددەساتی ئەم گەلە؟

چەند دەزگاو سەنتەری ڕۆشنبیری و نەتەوەیی دامەزراوە، بۆ پاراستنی قەوارەی نەتەوەیی و کەلتوری؟!

ئایا توانراوە ئەم وڵاتە لای نەوەکانی خۆشەویست بکرێت و لاوەکانمان ئەم وڵاتە بە زێدی خۆیان بزانن، یاخود لەگەڵ یەکەم فرسەتدا جێی دەهێڵن؟!!

ئایا بەرژەوەندییە گشتیەکانی وڵات و نەتەوە خراوەتە سەروو هەموو بەرژەوندییەکانەوەو وامان لێهاتووە بۆ یەك ئامانجی گەورەی نەتەوەیی هەوڵبدەین با لە بۆ چوونەکانیشماندا جیاواز بین؟

ئایا ئەو بەربەستانەمان شکاندووە کە دوژمنەکانمان دایان نابوو بۆ ڕێگرتن لە دەرکەوتنی وزەو لێهاتوویی و شارەزایی لاوەکانمان؟

ئایا هیچ گۆرانکارییەکی زانستیمان هێناوەتە گۆڕێ لە بوارەکانی خوێندن و سیستەمەکانیدا؟

ئایا توانیمان سوود لە مێشك و ژیری و بیری پرۆژەی نەوەکان وەربگرین؟!و پرۆژەی وەبەرهێنانی عەقڵ و تەکنەلۆژیا پیادە بکەین؟!

ئایا توانیمان نوێترین تەکنەلۆژیاو بیرو بەرنامەی پێشکەوتن بهێنینە ئەم وڵاتەوە جگە لە ئۆتۆمبیلە نوێیەکان؟!

ئایا چیمان کردووە بۆ دووبارە بنیاتنان و نۆژەنکردنەوەی کەسایەتی کوردی کە چەندین ساڵ دوژمنان هەوڵی تێکدان و شێواندنیان داوە؟!

ئایا ئەو بەها کۆمەڵایەتیانە چین کە لەو ماوەیەدا نەوەی دوای ئازادیمان لەسەری پەروەردە کردووەو لە ناخیاندا چاندومانە؟!

ئایا توانیومانە بیسەلمێنین کە ئێمە بەڕاستی دڵسۆزی ئەم وڵاتەین و گەل و وڵات لە سەرووی هەموو ئامانجەکانمانەوەیە!!

هەڵسەنگاندنی خۆمان و کارەکانمان لە ماوەی (١٨) ساڵدا، کارێکی زۆر پێویستە تا بزانین چیمان کردووەو ئێستا چی دەکەین و بەرەو کوێ دەچین و بەرنامەی ئەمڕۆو سبەینێمان چییە؟!

تا هیچ نەبێت هەندێك لە برینەکانمان سارێژ بکەین و هەموو وەکو یەك لاشەی پۆڵاین بۆ خزمەتی ئەم وڵاتە تێبکۆشین!!

# کارگێڕی به گوفتار

ڕەخنەگر ئەو کەسەیە کە نیشانەکانی ڕێگاوبان دەزانێت، بەڵام ناتوانێت ئۆتۆمبیل لێ بخوڕێت!

(کینبیت تینان)

دوودڵیو زۆر بیرکرنەوە لە هەڵسان بە کارێك، زۆر جار دەبێتە هۆی بە تەواوەتی وازهێنان لێی!

(یونغ)

هەر شتێك بتوانیت لە خەیاڵی خۆتدا وێنای بکەیت، ئەوا حەقیقەتە لای تۆ!

(بیکاسۆ)

هەر کەسێك کردارو گوفتاری یەك نەبوون، ئەوا سەر زەنشتی خۆی دەکات.

(ئیبن مەسعود)

ئازادیم خەڵاتی خودایە، ئەگەر لە دەستم دا ئەوا تەنها خۆم بەرپرسیارم!

(ئەمین ڕەیحانی)

شوێن کەوتنی نەریتە کۆنەکان، ئەوە ناگەیەنێت کە مردووەکان زیندوون، بەڵکو ئەوە دەسەلمێنێ کە زیندووەکان مردوون!

(ئیبن خەلدون)

سەرم سوڕماوە لەو کەسەی ڕۆژانە چەندین جار ڕووخساری دەشوات، بەڵام ساڵی جارێك دڵی ناشوات!

(میخائیل نەعیمە)

پیاو هەر بەمنداڵی دەمێنێتەوە، تا ئەو کاتەی دایکی دەمرێت، کاتێك دایکی مرد لە ناکاو پیر دەبێت!

(ناپلیۆن)

ئەگەر خەڵکی لە دواوە لێیان دای، بزانە کەوا تۆ لە پێشەوەی.

(پەندێکی فەرەنسی)

# کارگێڕی بە چیرۆک



# گوێ بۆ قسەی خەڵکی مەگرە!

کۆمەڵێـک بۆقـی بچـووک کـە ئەندامـی گروپێك بوون بەشداری دەکەن لە پێشبڕکێیەکدا بۆ سـەرکەوتن بـە سـەر لوتکەیەکی بـەرزدا، جەماوەرێکـی زۆریش کۆببوونـەوە بۆ بینینی پێشبڕکێکەو هاندانی بەشداربووان.

پێشبڕکێکە دەستی پێکرد:

هیـچ کەس لە بینەران لـەو بڕوایەدا نەبوو کە بۆقە بچوکەکان ئاواتەکانیان بەدەست بهێنن و بگەنـە کۆتایی لوتکەکە، سـەرەڕای ئەوەش ئەم جۆرە دەربڕین و وتانە لە بینەرەکان دەبیسترا:

ئاه بەڕاستی قورسە، هەرگیز ناتوانن بگەنە لوتکەکە، لەبەردەم بۆقەکاندا هیچ هەلێك نیە بۆ سەرکەوتن، قەڵاکە یەکجار بەرزو سەختە!

کەوتنە خوارەوەی یـەك لەدوای یەکی بۆقە بچوکـەکان بۆ سـەر زەوی دەسـتی پێکرد تەنها چەنـد بۆقێـك نەبێت کە زۆر بەخێرایی سـەر دەکەوتن، دوای کۆششـێکی زۆر گەیشتبوونە سێ یەکـی بەرزیەکە، بەڵام بینـەران بەردەوامبوون لە هاوارکردن و دەیانوت بەڕاسـتی سـەرکەوتن دژوارە، هیچ کام لە پێشبڕکێ کاران ناگەنە لوتکەی قەڵاکە، بۆقـەکان لە توانایاندا نیە سـەرکەوتن بەدەسـت بهێنـن، ژمارەیەکی زۆر لـە بۆقەکان بەهۆی بیستنی ئەو وشـە ڕوخێنەرانەوە توشی ماندوێتـی هاتن، بەڵام بۆقێکیـان بەردەوام بوو لەسـەرکەوتن و لە هەموویان زیاتـر بەرزببۆوە، خۆ بەدەستەوەدان لە فەرهەنگیدا نەبوو!

لـە کۆتاییـدا هەموو بۆقـەکان خۆیـان دا بەدەسـتەوە تەنها ئـەو بۆقە نەبێـت کە توانی بگاتە لوتکەو پێشبڕکێکە بەرێتەوەو سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، لێرەدا هەموو سەریان سوڕماو هەوڵیانـدا کـە بزانـن چـۆن ئەو بۆقـە توانی سەرکەوتن بەدەسـت بهێنێت لە کاتێکدا هەموو بۆقەکانـی تر دەستەوەسـتان بوون و شکسـتیان خوارد لە بە دەستهێنانی ئەو سەرکەوتنە.

یەکێك لە بە شداربووانی پێشبڕکێکە لە بۆقە سەرکەوتووەکەی پرسی: ئەو نهێنیە چی بوو کە وای لێکردیت سەربکەویت؟

بەڵام بۆقە سەرکەوتووەکە وەڵامی نەدایەوە! ئەزانن بۆ؟ لەبەر ئەوەی کەڕ بوو نەیدەبیست!

**لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:**

١- نابێت گوێ بۆ کەسـانی خراپ و ڕەشبین و ڕوخێنەر بگرین!

٢- پێویستە هەمیشـە وریای دەوروبەر بین، چونکـە هەندێك جار ئەگەر گـوێ بۆ بۆچوونە نێگەتیفەکانیـان بگریـن، کار دەکەنە سـەر بۆچوونەکانمان و قەناعەتەکانمان دەگۆڕن.

٣- پەنجەکانـت بخـەرە گوێچکەکانتـەوە لەبەردەم هەر کەسـێکدا کـە دەڵێت تۆ ناتوانیت ئەو کارە بکەیت.

٤- چاکـتر وایە خـۆت کەڕ بکەیـت لەبری ئەوەی شکسـت بخۆیت و خۆت تەسلیم بە قسەی خەڵکی بکەیت.

٥- ئـەو ئامانجـەی بە قەناعەتـەوە باوەڕت پێیەتـی کاری بـۆ بکەو لە هەوڵدان مەوەسـتە بۆ گەیشـتن پێی، هەرگیز قسەی خەڵکی ساردت نەکاتەوە.




# کارگێڕی یان بەڕێوەبردن؟

**لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارییە لە نێوان هەردوو زاراوەی (کارگێڕی و بەڕێوەبردن)دا.**

زاراوەی کارگێڕی (MANAGEMENT) یان بەڕێوەبردن (ADMINISTRATION) لە زمانی عەرەبیدا مانای هەردوو زاراوەکە واتە (الإدارة).

زانستی بەڕێوەبردن یەکێکە لە زانستە گرنگەکانی سەردەمی ڕابردووو ئێستا، پاشان حەزدەکەم ئەوە بڵێم کە سەرهەڵدانی بیرۆکەی لێکۆڵینەوەکەم و بەراوردکردن لەنێوان ئەم دوو زاراوەیە لە دوای خوێندنەوەی پەرتووکی (دارایی گشتی)ەوە هات کە دانەرەکەی مامۆستا (ئەیوب ئەنوەر سماقەیی) بوو لە زانکۆی سەلاحەدینی هەولێر لەبەرگی پشتەوەی پەرتووکەکە نووسرابوو مامۆستای یاریدەدەرە لە (کۆلێژی بەڕێوەبردن و ئابووری)، ئالێرەوە ئەو ڕستەیە سەرنجی ڕاکێشام بۆ لێکۆڵینەوە لە هەردوو زاراوەی کارگێڕی و بەڕێوەبردن، چونکە لە زانکۆی سلێمانی پێی دەوترێت (کۆلێژی کارگێڕی و ئابووری)، بۆیە بڕیارمدا بگەمە دەرئەنجامێك لە ڕاستی و دروستی بەکارهێنانی ئەم زاراوانە بەپێی توانای زانستی خۆم لەو بوارەداو بەپشت بەستن بە چەند فەرهەنگێکی عەرەبی و ئینگلیزی کە پێناسەی هەردوو زاراوەی کارگێڕی و بەڕێوەبردنیان کردووە، لە زۆربەی فەرهەنگەکاندا زاراوەی (ADMINISTRATION) زیاتر گشتییەو مانای زۆربەی بەشەکانی ئەو زانستە لەخۆ دەگرێت و لەڕووی مێژووییەوە کۆنترە، بەڵام زاراوەی (MANAGEMENT) تازەترەو لە ووشەی بەڕێوەبەرەوە (MANAGER) هاتووە، دوای ئەوە ئەگەر سەرنج بدەین لە زۆربەی پەرتووکە کارگێڕییەکاندا زاراوەی (MANAGEMENT) بەکار هاتووە واتە وەکو بەشێك لە بواری بەڕێوەبردن بۆ نموونە (کارگێڕی دارایی FINANCIAL MANAGEMENT

- کارگێڕی بازارسازی MARKETING MANAGEMENT- کارگێڕی بەرهەم و پرۆسەکان PRODUCTION AND OPERATION MANAGEMENT
- کارگێڕی سەرچاوەی مرۆیی HUMAN RESOURCE MANAGEMENT)

لێرەدا ئەو پرسیارەمان لا دروست دەبێت بۆچی لە زۆربەی پەرتووکەکاندا بەو شێوەیە بەکارهاتووەو وشە گشتییەکە بەکارنەهاتووە؟ وەڵام بۆ ئەم پرسیارەش تەنها ئەوەیە کە ئەو پەرتووکانە دەلالەت لە بەشێکی زانستی بەڕێوەبردن دەکات.

نموونەیەکی تریش کە تا ڕادەیەکی زۆر ئەو گریمانەیە پشتڕاست دەکاتەوە ئەویش ناوی بەشی کارگێڕی و بەڕێوەبردنە لە پەرتووك و بڕوانامەکانی بەشی بەڕێوەبردندا بۆ نموونە لە یەکێك لە پەرتووکەکاندا نووسراوە (کارگێڕی ستراتیژی / STRATEGIC MANAGEMENT کۆلێژی بەڕێوەبردنی کار COLLEGE OF BUSINESS ADMINISTRATION) دەکرێ لێرەدا بڵێین بۆچی ناوی کۆلێژەکە نەنووسرا (MANAGEMENT)؟ یان بۆچی ناوی پەرتووکەکە (STRATEGIC ADMINISTRATION) نەبوو؟ کەواتە بۆمان ڕووندەبێتەوە کە ئەو وشەیە بە مانای بەشێك دێت لە زانستی بەڕێوەبردن، بەڵام کۆلێژی بەڕێوەبردنی کار باس لە لقەکان و




زانستی بەڕێوەبردن دەکات بە شێوەیەکی گشتی بۆیە دەنووسرێت (ADMINISTRATION)، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی بابەتەکە دەمەوێت چەند نموونەیەکی تر بخەمە ڕوو پاشان ڕوونیان بکەمەوە بۆ زیاتر دڵنیابوون لە دروستی بەکارهێنانی ئەو زاراوانە، بۆنموونە هەندێك فەرمانگە هەیە کە بەزمانی عەرەبی (مدیرية)ی پێدەگوترێت وەکو (بەڕێوەبەرایەتی گشتی تۆمارکردنی کۆمپانیاکان) کەواتە لە ناو ئەو بەڕێوەبەرایەتیەدا بەڕێوەبەرو کارگێڕو کارمەندو چەند بەشێك هەیە، بۆنموونە بەشی کارگێری هەیە، سەرۆك بەش هەیە، لەبەر ئەوەی بەشێکە هەروەکو بەشەکانی تر بۆیە بە کارگێری ناودەبرێت، بۆ پێی دەوترێت بەڕێوەبەرایەتی پێی ناوترێت کارگێرایەتی یان کارگێری، چونکە بەڵگەیە لەسەر هەموو بەشەکانی ئەو دامەزراوەیە، لە هەمانکاتدا بەڕێوەبەر لەبەر ئەوەی سەرپەرشتیاری گشتی ئەو دامەزراوەیەیە بۆیە بە بەڕێوەبەر ناودەبرێت، چونکە کارەکەی گشتییە، بەڵام هەر لەناو ئەو دامەزراوەیەدا ئەو کارمەندەی لە بەشی کارگێری کاردەکات بە کارگێر ناو دەبرێت، چونکە کارێکی دیاریکراو دەگێرێت، ئەوە جیاوازییەکە دەرئەخات و ڕوونیدەکاتەوە کە زاراوەی (ADMINISTRATION) شێوەیەکی گشتگیر وەردەگرێ و زاراوەی (MANAGEMENT) شێوەیەکی بەشی (جزئی) وەردەگرێت، یان بۆ نموونە لە فەرهەنگەکاندا (الاجراءات الإدارية - ADMINISTRATIVE PROCEDURES) یان (القانون الإداری - ADMINISTRATIVE LAW) هاتووە، لێرەدا لەبەر ئەوەی هەردوو زاراوەکە گشتییەو هەموو ئاستەکانی کارگێری دەگرێتەوە، چونکە یاسا بنەمایەکی گشتگیرەو بەسەر هەمووواندا جێبەجێدەکرێت کەواتە یاسای بەڕێوەبردنیش بە هەمان شێوەیە، لەبەر ئەوە زاراوەی (MANAGEMENT یان MANAGERIAL) بەکارنەهێنراوە.

لە کۆتایدا ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەسەرەوە خراونەتە ڕوو دەمانگەیەنێت بەو دەرئەنجامەی کە دەکرێت ئەو زاراوانە بەپێی ئاستەکانی بەڕێوەبردن و کارگێری بەکاربێت و جیاوازی لە نێوانیاندا بکرێت، ماوەتەوە ئەوەی بڵێم (کۆلێژی بەڕێوەبردن و ئابووری پەسەند ترو درووسترە لە کۆلێژی کارگێری و ئابووری)، چونکە ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەسەرەوە باسکراون ئاماژە بە گشتێتی و بەشبەشیی ئەو دوو زاراوەیە دەکەن، من وەك خوێندکارێکی قۆناغی سێهەمی بەشی بەڕێوەبردنی کار، لەدوای ٦ساڵ خوێندنم لەو بوارەداو ٣ ساڵ کارکردن لەبواری بەڕێوەبردندا گەیشتوومەتە ئەوەی خوێندنەوەی من بۆ ئەو زاراوانە بەو شێوەیە بێت بۆیە هەستام بە لێکۆڵینەوەو بەراورد کردن لە نێوانیاندا، جا دەکرێ ئەم لێکۆڵینەوەیەی من وەك بیردۆزێك سەیر بکرێت، چونکە سەد لە سەد ڕاست و بێکەم و کوری نییەو شایانی ڕوونکردنەوەی زیاترو ڕەخنە لێگرتنە، بۆیە ئەم بابەتە پێشکەش دەکەم بە هەموو مامۆستاو خوێندکارەکانی ئەو بوارە لە هەموو بەشە زانستییەکانی بەڕێوەبردن و کارگێری لە زانکۆ و پەیمانگاکان بەتایبەتی زانکۆی سلێمانی.

بەخۆشحاڵییەوە پێشوازی هەر ڕەخنەو بۆچوونێکی پێچەوانە بە بۆ چوونی خۆم دەکەم و هەوڵ دەدەم سوودیان لێ وەربگرم.

ئەو سەرچاوانەی لە وەرگێڕانی زاراوەکاندا سوودی لێوەرگیراوە ئەمانەن:-

* معجم مصطلحات المكتبات والمعلومات/ إعداد: الدكتور عبدالغفور عبدالفتاح قاري/ سنة ٢٠٠٠

* معجم مصطلحات العلوم الإدارية الموحدة/ بشير عباس العلاق/ سنة ١٩٨٣

# بەڕێوەبەری خراپ مایەی نەخۆشی دڵە بۆ کارمەندانی

و/ پشتیوان مبارك

لێکۆڵینەوەیەکی نوێ ئاشکرای کرد کە بەڕێوەبەری خراپ تەنها نابێتە هۆکاری فشاری دەروونی بۆ سەر کارمەندەکانی، بەڵکو لە مەترسی تووشبوونیان بە نەخۆشییەکانی دڵ زیاد دەکات، کاتێك تیمێکی سویدی پەیوەندییەکی بەهێزیان دۆزییەوە لە نێوان سەرکردایەتی خراپ و توندوتیژی بەڕێوەبەرەکان یان خاوەن کارەکان و مەترسی تووشبوون بە نەخۆشییە ترسناکەکانی دڵ و فشارو پەستانی دڵی فەرمانبەران، ئەمەش دوای لێکۆڵینەوەیەك کە تیمەکە لەسەر (٣٠٠٠) فەرمانبەری پیاو ئەنجامیاندا.

لێکۆڵینەوەکە هۆشیاریدا کە مەترسی تووشبوون بەم نەخۆشیانە زیاتر دەبێت ئەگەر فەرمانبەرەکە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە هەمان کۆمپانیا کار بکات.

پسپۆڕانی بواری دەروونناسی دەڵێن: کاتێك کارمەند هەستی کرد کەسەرۆك کارەکەی نرخی کارەکەی نازانێت و پاڵپشتی ناکات، هەست بەفشاری دەروونی دەکات، ئەمەش دەبێتە پاڵنەری هەر فەرمانبەرێك بۆ خەریکبوون بە هەندێك خووی خراپەوە کە زیانبەخشە بۆ سەر تەندروستی وەکو: جگەرە کێشان کە دەبێتە هۆی تووشبوون بە نەخۆشییەکانی دڵ.

هەروەها هەمان لێکۆڵینەوەی پێشوو ئاشکرای کرد کە بەڕێوەبەر یان خاوەنکاری زۆردار دەبێتە هۆی بەرزی پەستانی خوێنی فەرمانبەرەکانیان کە بەڵگەیە بۆ ئەوەی بەردەوامی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن لە دەرئەنجامی کۆتایدا ئەگەری مەترسی تووشبوون بە نەخۆشییەکانی دڵ زیاد دەکات. سەرچاوە ژمارە -٤٠٠- (المرأة اليوم).

# ڕۆڵی سکرتێر لە ڕێکخستن و



زنجیرەی هەشتەم

## سکرتاریەت

سکرتێر ڕەگەزی گرنگ و کارایەو یەکێکە لە پایە سەرەکیەکانی کۆبوونەوە، ئەمەش بەو ڕۆڵ و ئەرکەدا دەردەکەوێت کە لەمیانەی ئامادەکارییە کارگێڕی و هونەرییەکانی کۆبوونەوەکە پێی هەڵدەستێت. سکرتێر بەپێی ئەو ئەرکەی لە ئەستۆیدایە بەشدارە لە بەدیهێنانی ئامانجە پێشبینیکراوەکان و هەروەها بەیەکێک لە فاکتەرەکانی سەرکەوتن و شکستی کۆبونەوەکە دادەنرێت.

دەکرێت ئەرك و ڕۆڵی سکرتێر لە سازکردنی کۆبوونەوەدا بە سێ هەنگاو دیاری بکەین:

**★ هەنگاوی یەکەم: قۆناغی ئامادەکاری کۆبوونەوە:**

وەرگرتنی داخوازی و پێشنیاری ئەو بەڕێوەبەر و سەرۆك بەش و لێپرسراوانەی کە بڕیارە لە کۆبوونەوەکەدا بەشداربن، هەروەها دیاریکردنی ئەو بابەتانەی کە حەزدەکەن لە چوارچێوەی خشتەی کارەکانی کۆبوونەوەکەدا بەووردی باس بکرێن. بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە سکرتێر چەند پەیامێکی تایبەت ئامادەبکات و بینێرێت بۆ ئەو کەسانەی کە بڕیارە لە کۆبوونەوەکەدا ئامادەبن، گرنگی ئەم پەیامانەش لەم خالانەدا دەردەکەوێت:

١- هاوکاری کارگێری باڵا دەکات کە ئاگادار و ئاشنابێت بەو بابەت و گیروگرفتانەی کەپەیوەستن بە کارکردن، ئەمەش لە ڕوانگەی ڕاوبۆچوونی کارگێرییە جێبەجێکارەکانەوە دەبێت.

٢- کۆکردنەوەی داواکاری و داخوازییەکان و ڕێکخستنیان و سەرلەنوێ دارشتنەوەیان بە لەبەرچاوگرتنی دووبارە نەخستنەوە ڕووی هیچ بابەتێك زیاتر لە شوێنێك و پاشان بخرێنە بەردەم سەرۆکی کۆبوونەوەکە بۆ ڕیز بەندکردنەوەی بابەتەکان بە پێی گرنگیان.

٣-ئامادەکردنی خشتەی کارەکانی کۆبونەوەکە، کە پوختەیەکی چڕوپڕی تێدابێت دەربارەی ئەو بابەتانەی کە لە میانەی کۆبوونەوەکەدا باسدەکرێن و گفتوگۆیان لەسەر دەکرێت.

٤- ناردنی خشتەی کارەکان بۆ ئەو کەسانەی کە بڕیارە لە کۆبوونەوەکەدا بەشداربن- ئەمەش دەبێت بەماوەیەك پێش سازدانی کۆبوونەوەکە ئەنجام بدرێت- بۆ ئەوەی بەشداربووان کاتی تەواویان هەبێت بۆ لێکۆڵنەوەو پێداچوونەوەی هەموو لایەنەکانی خشتەکەو هەستن بە ئامادەکردنی یاداشتی دیدو بۆچوونەکانیان تاکو بتوانن لەمیانەی کۆبوونەوەکەدا بەشداری کارایان هەبێت بە دەربڕینی ڕاوبۆچوونەکانیان.

٥- سەرپەرشتی ئامادەکردن و ڕێکخستنی شوێنی کۆبوونەوەکە بکرێت لە سەر بنەمای ژمارەی بەشداربووان.

٦- بەرۆژێك پێش بەستنی کۆبوونەوەکە بەشداربووان لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە لە کات و بەرواری دەستپێکردنی کۆبوونەوەکە دڵنیابکرێنەوە.

**★ هەنگاوی دووەم: کارەکانی سکرتێر لە کات و ڕۆژی کۆبوونەوەکەدا:**

- هەر ئەندامێکی بەشداربوو ڕێنمایی بکرێت بۆ شوێنی دانیشتنی دیاریکراوی خۆی تا دانیشتنەکە بەو شێوەیە بەڕێوە بچێت کە پلانی بۆدانراوە.

- دابەشکردنی پێنووس و دەفتەری تێبینی بەسەر ئامادەبوواندا، لەگەڵ ئامادەکردنی بەڵگەنامەی پێویست بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتانەی کە لە چوارچێوەی خشتەی کارەکانی کۆبوونەوەکە بڕیاریان لەسەردراوە.

- بەشێوەیەکی گشتی خشتەی کارەکانی کۆبوونەوە ئەم هەنگاوانە دەگرێتەوە:

١- دەستپێکی کردنەوەی کۆبوونەوەکە»بەناوی

# سازدانی کۆبوونەوەدا

عومەر عبدالقادر-کۆلێژی تەکنیکی سلێمانی



زنجیرەی دەیەم

## هونەری کۆبوونەوە

خوای بەخشندەی میهرەبان».

٢.دیاریکردنی بەروارو رۆژو کاتژمێری دەستپێکردنی کۆبوونەوەکە.

٣.تۆمارکردنی دەستپێکی کۆبوونەوەکە بەسەرپەرشتیکردنی (......) وناوی ئامادەبووان و ئەوانەش کە ئامادەنەبوون و پۆزشیان بۆ ئامادەنەبوونەکەیان هێناوەتەوە،و هۆکاری نەهاتنەکەیان روونبکرێتەوە و تۆماربکرێت.

٤.نووسینی راوبۆچوونی سەرجەم ئامادەبووان جا بەمەبەستی ورووژاندنی هەربابەتێکی کۆبوونەوەکە بێت، هەروەها تۆمارکردنی گرنگترین گفتوگۆ و بۆچوونەکان بەپێی پێویست و بەشێوەیەکی کورت و پوخت.

٥.تۆمارکردنی ئەو بریارو راسپاردانەی کە لە بارەی هەربابەتێکەوە دەردەچن و هەژمارکردنی دەنگە هاوراکان (الموافقین) و دەنگە بەرهەڵستکارو ناکۆکەکان و نووسینی راوبۆچوونی هەردوولایان.

٦.نووسینی ئەو تێبینی و پێشنیارانەی کە سەرۆکی دانیشتنەکە داوادەکات لە رەشنووسی کۆتایی کۆبوونەوەکەدا تۆمار بکرێن.

٧.دەستنیشانکردنی کاتژمێری کۆتایی کۆبوونەوەکە.

٨.دیاریکردنی کاتی کۆبوونەوەی داهاتوو.

- لەلاوە کاربکرێت بۆ سەرکەوتنی کۆبوونەوەکە، ئەمەش بە بەگەرخستنی ئەوپەری هەوڵ و کۆشش بەپێشکەشکردنی خزمەتگوزاری گونجاوو رەخساندنی کەشێکی هێمن و ئارام بۆ ئامادەبووان دێتەدی.

- لەمیانەی بەرێوەچوونی کۆبوونەوەکە بەهیچ جۆرێك خۆهەڵنەقورتێنرێت لە گفتوگۆکان و دیدو بۆ چونێکی دیاریکراو نەخرێتە روو لەکاتێکدا کە تایبەت نەبێت بە پسپۆری و تایبەتمەندی سکرتێرەوە.

- بەشدارینەکردن لە دەنگدان لەسەر ئەو بریارانەی لە میانەی کۆبوونەوەکەدا دەردەچن،لە کاتێکدا ئیشی سکرتێر ئەوەیە بە راوبۆچوونەکانی بەشداربێت لە تاووتوێکردنی بابەتە پێشنیارکراوەکان لە سنورێکی دیاریکراودا، بەڵکو زیاتر یارمەتیدەربێت لە سەرکەوتنی کۆبوونەوەکە.

سرتە سرت نەکردنی بەردەوام لەگەڵ سەرۆك یان لەگەڵ هەر ئەندامێکی تر مەگەر زۆر پێویست بێت.

-کۆتایی پێهێنانی کۆبوونەوەکە (بە ریزلێنان و سوپاسکردنی ئەندامانی بەشداربووی کۆبوونەوەکە لە لایەن سەرۆکی دانیشتنەکەوە).

* هەنگاوی سێیەم: کارەکانی سکرتێر دوای کۆتاییهاتنی کۆبوونەوەکە.

- ئەگەر وتووێژەکانی ناو کۆبوونەوەکە بە ئامێری تەسجیل (تۆمارکەری دەنگ) تۆمارکرابن،پێویستە لەسەر سکرتێر دووبارە تەواوی وتووێژەکان لەسەر کاغەز کۆنووس بکاتەوە بەشێوەیەك کە ئامادەبن بۆ چاپکردن.

-رەشنووسی کۆبوونەوەکە بەشێوەیەکی هەماهەنگ بنوسرێتەوە، بەرەچاوکردنی بنەماکانی شوێن پێهەڵگرتنی (المتابعە) ئامادەکردنی رەشنووسی کۆبوونەوەکان.

- دوای دارشتنی کۆتایی رەشنووسی کۆبوونەوەکەو چاپکردنی، چەند دانەیەکی زیادەی لەبەر بگیرێتەوە بۆ ئەوەی دابەش بکرێت بەسەر ئەندامانی ئامادەبوو، چەند دانەیەکی تریش لە دۆسییەکانی تایبەت بە بەڵگەنامەکانی تایبەت بەم بابەتەوە هەڵبگیرێن و بپارێزرێن.

- بەدواداچوون بکرێت بۆ ماوەی جێبەجێکردنی ئەو بریارانەی کە پێشتر لەهەر دانیشتنێك لە دانیشتنەکانی کۆبوونەوەکە دەرچوون.



# چۆن ڕێکخراوەکەت بەرەو پێش دەبەیت؟

نا/ ئەندازیار حسین نەجمەدین ڕەسول

توانای هەر ڕێکخراوێك (دامە زراوەیەك) بۆگۆڕانکاری، هۆکاری بنەڕەتی سەرکەوتنی ئەو دامەزراوەیە لە ئێستاو داهاتوودا، هەروەها پێویستە بزانین تەنها (شتی نەگۆڕ لە ژیاندا بریتییە لە گۆڕان)، پێویستە بۆهەر گۆڕانو بەرەوپێشچونێك پلانێکی توندو تۆڵو هەمەلایەنە هەبێت، ئەگەر ئێمە باسی گەشە پێدانی کارگێری بکەین لەناو دامەزراوەکاندا ئەوا پێویستە ئەم گۆڕانو گەشە پێدانە بەپێی بنەماو پێوانەیەکی دیاری کراو بێت، چونکە زانستی نییە بەڕێوەبەرێك هەوڵ بدات بۆگۆڕانی دامەزراوەکەی بێ دیاریکردنی بنەماو خاڵبەندی قۆناغ بە قۆناغی ئەو کارەی دەیەوێت ئەنجامی بدات.

بۆ ئەوەی ئەم گۆڕانکارییە کاریگەر بێت پێویستە هەر لە سەرەتاوە لەسەر پلانی وورد دابنرێت بە ڕەچاوکردنی حاڵی ئێستای دامەزراوەکەو چۆنیەتی گواستنەوەی بۆبارێکی باشتر لەداهاتوودا، بۆ ئەمەش شیکردنەوەی هەموو ئەو پێکهێنەرانەی کە ئەم گۆڕانە دەستە بەر دەکەن.

سەرەتای گەشە پێدان:

(میشیل بییرۆ)و هاوەڵەکانی ئەم پرسیارە ڕووبەڕووی ئەو کەسانە دەکەنەوە کە دەیانەوێت گۆڕانکاری بکەن..... (بۆچی بەرنامەی گۆڕانکاری گۆڕانکاری دروست ناکات؟) بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە پاش هەڵسەنگاندنو لێکۆڵینەوەی زۆر گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی کە (٥) هەنگاوی گرنگ هەیە بۆ گۆڕانکاری کاریگەر کە لەسەر زەمینەی ڕێکخستنەوەی ئەرکەکان دەست پێدەکات کە بریتییە لە دووبارە ڕێکخستنەوەی ڕۆڵی کارمەندو هاوکارانو بەرپرسیاریەتیو پەیوەندییەکان بۆچارەسەری گرفتو پێش هاتەکان بریتییە لە:

١- ئامادەکردنی پابەند بوون بە گۆڕانو گەشە پێدان لە ڕێگای شیکردنەوەی هاوبەش بۆچارەسەری گرفتەکان.

٢- دروستکردنو ئامادەکردنی تێروانینێکی هاوبەش بۆ ڕێکخستنەوەی ئیدارە بە شێوەیەك خزمەت بە هێنانەدی ئامانجەکان بکات بۆنموونە: دروستکردنی ڕۆحی کێبەرکێو منافسە بە شێوەی ئیجابی لە نێوان بەشەکانو لقەکانی ڕێکخراوەکەدا (دامەزراوەکەدا).

٣- دەستەبەرکردنی کۆدەنگیو تێڕوانینی نوێو چەندێتی کاریگەرییان.

٤- دەستەبەرکردنی زیندوێتیو بەهێزی لەهەموو بەشەکاندا.

٥- ڕێکخستنەوەی ستراتیژیات بە ڕەچاو کردنی ئەو گرفتانەی لە کاتی گۆڕانکاریدا دروست دەبێت.

بنەماکانی گەشەپێدان بە شێوەیەکی فراوانتر:

چەند بنەمایەکی فراوانتر هەیە بۆگەشە پێدان کە پێشنیاری (دوگلاس سمیسە):

١- ئامانجی گۆڕان:

ئامانج بنچینەی گۆڕانە کەمێك لە خەڵکی گۆڕان دەکەن لە پێناوی گەشەپێداندا بەتایبەت

لە ڕێکخراوەکاندا، بەڵام گۆڕانکاری دەکەن کاتێك بزانن بەشداری تاکە تاکەی ئەوان کاریگەری دەبێت لەسەر بەرهەمو داهاتووی ڕێکخراوەکە، بۆیە پێویستە ئامانجی گۆڕانو گەشەپێدانەکەت بۆتاکە تاکەی بەشداران (فەرمانبەران)ڕوون بکەیتەوە تا ئەوانیش بەشدار بن.

٢- تیمی کار:

کەس ناتوانێت تەواوی ڕەوشتی (سلوك) کەسی تر بگۆڕێت بەڵکو پێویستە هەر تاکێك لەتاکەکانی تیمی کار بەرپرسیاری گۆڕانکاری لە خۆیان هەڵبگرن، هەروەها پێویستە زۆرترین ژمارەی ئەو تاکانە کۆبکەیتەوە کەتوانای هەڵگرتنی ئەو بەر پرسیاریەتیەیان هەیەو بۆئامادەکردنی تیمی کار بەزمانی (ئێمە) نەك (من) گفتوگۆبکات.

٣- ئاشنا کردنی ئەندامان بە ڕۆڵیان لەکاری گەشەپێداندا:

پێویستە هاوکاری ئەندامانی تیمەکەت بکەیت بە بەردەوامی بۆئەوەی تواناو لێهاتووییەکانیان ببەستیتەوە بە ڕێکخراوەکەوە، واتە پێویستە خۆتو هاوکارانت پێشەنگ بن بۆبەڕێخستنی کاری گەشەپێدان.

٤- ڕاهێنان پێکردنو هاوکارییان بە زانیاری پێویست:

پێویستە کار بکەیت لەسەر ئەوەی کە کەشو هەوایەکی لەبار دروست بکەیت تا ئەندامان دڵنیاییو بواری خۆتاقیکردنەوەیان هەبێت لەو شتانەی وەریان گرتووەو دەیانەوێت ئەنجامی بدەن.

٥- هاوکاری ڕاوێژکاران: بۆئەنجامدانی گۆڕانکاری هاوکاریو پاڵپشتی ڕاوێژکاران پێویستە لە بوارە جۆراو جۆرەکاندا کە دامەزراوەکەت کاریگەری لەسەری دەبێت یان ئەو بوارانەی بەرهەمی تێدا دەخاتە بازاڕەوە.

لە کۆتاییدا:

ئایا خوێ دەکەیتە خواردنەکەت پێش ئەوەی تامی بکەیت؟

هنری فورد/ زانای بەناوبانگو داهێنەری (فۆرد) ملیاردێری ئەمریکا بۆدانانی هەر بەڕێوەبەرێکی نوێ لەگەڵی دەچوو بۆ نانخواردنێك بۆسەرنج دان لە هەڵسو کەوتی جا ئەگەر ئەو کەسە کە پێشنیارکراوە بۆئەوەی بکرێتە بەڕێوەبەر پێش ئەوەی لە خواردنەکە بخوات خوێی تێ بکردایە ئەوا (فورد) دامەزراندنی ئەو بەڕێوەبەرەی هەڵدەوەشاندەوە، چونکە لای وابوو کە ئەوە نیشانەیە بۆ ئەوەی ئەو بەڕێوەبەرە پێش ئەوەی پلانەکە تاقی بکاتەوە دەست بەجێبەجێکردنی دەکات. ئەم حاڵەتەش چەند جار ڕووی داوەو کەسی پێشنیار کراو دانەنراوە.

ڕاوێژکاری گۆڕانکاری (ڕوبرت جاکوبس) دەڵێ: (ئەو دامەزراوانەی کە لە ئێستاو داهاتوودا سەرکەوتوو دەبن ئەو دامەزراوانەن کەتوانای گۆڕانکاری کاریگەریان هەیە کە هەموو لایەنەکانی سستمەکە بگرێتەوە).

# خەڵاتی فەرمانبەرەکەت بکە بێ سەرفکردنی پارە

محمد هاشم محمد

خەڵات یان زیادەی مووچە... کێ هەیە لە ئێمە حەزی لێ نەبێت؟! بەڵام ئەمە تاکە ڕێگا نییە بۆ خەڵاتکردنی فەرمانبەرو کرێکارەکانت، چونکە زۆر جار هەندێ شێوازی تر هەیە کاریگەری زیاترە، بەتایبەتی ئەگەر بتەوێ کەموکوڕی ڕوونەدات لە هاوسەنگی دارایی کۆمپانیاکەتدا.

لێرەدا چوار شێوازی گرنگ دەخەینە ڕوو کە یارمەتیدەرێکی باشە بۆ ئەو بەڕێوەبەرانەی کە دەیانەوێ پەرە بە ئیشو کارەکانیان بدەنو فەرمانبەرەکانیان هان بدەن بێ ئەوەی یەك دینار سەرف بکەن:

١- بواریان پێبدە با خۆیان خشتەی کارەکانیان ڕێکبخەنو ئامادەی بکەن:

ئەگەر هاتوو فەرمانبەر چوستو چالاكو پابەندبوو بەو بەڵێنانەی کە دەیدات بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە پێی ڕادەسپێردرێت لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا، ئەوا بۆ زیاتر بواری نادەیتێو سنووری کارکردنی فراوانتر ناکەیت بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی خۆی؟! ئەمە کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر هەستکردنی فەرمانبەرەکەت بە متمانەیەکی زۆر بەخۆیو پاڵنەرێك لەناخیەوە دروست دەبێت بۆ ئارام گرتنێکی زیاتر لە بەرپرسیارێتیو بەرەنگار بوونەوەو چارەسەر کردنی کێشەکان، وەکو کاتێکی کەمتر دابنێیت بۆ پشوودانی نانخواردنی خۆی، یان کەمکردنەوەی ئەو پشوو ڕێپێدانانەی کە مافی خۆیەتی وەری بگرێت ئەگەر پێویست بوو.

٢- یارمەتیان بدە بۆ گەیشتن بە پلەی بەرزتر لە کۆمپانیاودەزگاکەتدا:

بێ گومان لە سوودو قازانجی تۆیە وەك بەڕێوەبەرێك کە پارێزگاری لە فەرمانبەرە زیرەكو ڕاستگۆو ئازاکانت بکەیت، بەڵام ئاگاداربە ئەم پارێزگاریکردنە نەبێتە دەست پێوەگرتنیانوفەرمانبەرەکانت وا لێ بکەیت هەر لەو بەشەی خۆیان بمێننەوەو بەهەمان پۆستو هەمان مووچە، هەرچەند خۆی ماندووبکاتو زیرەکی بنوێنێت هیچ گرنگی پێ نەدەیت؟! ئەمە دەبێتە هۆکارێك بۆ کوشتنو نەهێشتنی ئەو داهێنانو بەهرەو توانایانەی کە لە ناخیدا هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر فەرمانبەر هەست بەوە بکات کە ڕوو بەڕووی سزا دەبێتەوە ئەگەر هاتو کەمتەرخەمی کردو خەڵات ناکرێ لەسەر کارە باشو چاکەکان، ئەوا وای لێدێت خۆی دوورە پەرێز بگرێت لەکاتی کەمتەرخەمیو جێبەجێکردنی کارەکان!

بۆیە پێوستە کرێکارو فەرمانبەری باشو چالاك خەڵات بکرێتو پۆستی بەرزبکرێتەوەو هەندێ تایبەتمەندی تازەی پێبدرێت ئەگەر بە گواستنەوەشی بێت بۆ بەشێکی بەرز تر، ئەم خاڵە سروشتێکە بۆ ئەو کەسە، کە تۆ ڕێز لە فەرمانبەرەکانت دەگریتو چۆن گرنکی بە سوودو قازانجی خۆتو کۆمپانیاکەتو کارگەکەت دەدەیت ئەوا لەهەمان کاتدا ئەوانیشت لەیاد ناچێت.

٣- هەندێ کاری زۆر تایبەتیو گرنگیان پێ ڕابسپێرە:

بەراستی فەرمانبەری چاكودیاروچالاك شایانی هەندێ کاری گرنگە کە پێی بسپێریت، هەر بۆیە ڕای مەسپێرە بەهەندێ کاری لاوەکیو بێ بایەخو بچووك کە ببێتە هۆی دابەزاندنی هیممەتو تواناکانیو هەست بەوە بکات کەئەو جێگای متمانە نیە، وەك ئەوەی داوا لە ژمێریارەکەت بکەیت کەهەندێ نووسینی سادەت بۆ بنووسێتەوە بەشێوەیەکی بەردەوام، ئەمە دەبێتە هۆی کوژاندنەوەی تواناکانیو وردە وردە بێزار دەبێتوئەم تەکلیفە هەستێك لەناخیدا دروست دەکات کە ئەو لێپرسراو نیەو شایانی هیچ ڕێزێك نیە.

٤- کارەکانیان بەگرنگ سەیر بکەو جار جار بەشانو باڵیاندا هەڵبدە:

ئاگاداربە ئەو مرۆڤە هێشتا نەهاتۆتە دونیاوە کە حەزی لە مەدحو پیاهەڵدان نەبێت! هەموومان ئارەزومان لە پیاهەڵدانو ستایش کردن هەیە، ئەمەش لە پێش چاوی خۆتدا دابنێ کاتێك کە بیر لە خەڵاتکردنی فەرمانبەرو کرێکارەکانت دەکەیتەوە.

پێداهەڵدانو باسکردنی چالاکیەکانی فەرمانبەری باشو لێهاتوو لە پێش چاوی هاوڕێکانی وای لێ دەکات هەست بە گەورەییو پەرۆشی بکاتو لەهەمان کاتدا دەبێتە هاندەرێکی زۆر گەورە بۆ فەرمانبەرو کرێکارەکانی تریش کە هەوڵ بدەن بەدوای هەنگاوەکانی ئەودا بڕۆن.

ئەوەندە لەبیر نەکەیت، ئەم هەنگاوە چەکێکی دوو جەمسەرە، بەشانو باڵ هەڵدانێکی زیاد لە سنووری خۆی دەبێتە هۆی تەمبەڵیو پشوودانێکی زۆرو کەمبوونەوەی چالاکیەکانی، چونکە ئەو هەموو کات هەست بە جیاوازی دەکاتو هەستێکی لا دروست دەبێت کەهەر ئیشو کارێك ئەو ئەنجامی دەدات بێگومان زۆر باشەو کەسی تر ناتوانێت بیکات!

The Motivational Manager Magazine
Four ways to reword employees
without spending any money
By: George T. Fuller
Page : 1

بەشی یەکەم

# کات ژیانە!

و/ محمد شێخ حسن

یەکەم:چۆن کاتەکانت ڕێکدەخەیت؟

گرنگــی دان بــە (کات) ئەرکــی سەرشــانی هەموومانــە چونکــە کات ژیانــە، کات ســامانە لەگەڵ هەموو چرکەیەکی کاتژمێردا تەمەن کەم دەبێتــەوەو هەلەکانی ژیانت لەدەســت دەچێت ئەگەر ئاگاداری خۆمان نەبین.

پێویستە ڕێگە نەدەین بەخەڵکی ئەم سامانو ژیانو تەمەنەمــان بە فیرۆبدەن، تەنانەت ڕێگە بەخۆشــمان نەدەیــن کە بەخۆڕایــی کاتەکانمــان تێپەربێت بەبێ ئەوەی سود بەخۆمانو کۆمەڵگا بگەیەنین.

پێشینان وتویانە  هەموو ڕۆژێکی نوێ پێمان دەڵێت:

(ئــەی خەڵکینــە مــن ڕۆژێکــی نوێــم، شــایەتم لەســەر هەموو کردارێك کە لە میانەی کاتەکانمــدا ئەنجامی دەدەیــت، چاکەم تیادا بکە با شــایەتی باشــت بۆ بدەم، چونکە کە تێپەڕیم ناگەڕێمەوە)!

ئایا دەگونجێت هەستین بە کرینی کات؟
ئایا دەگونجێت هەستین بە قەرزکردنی کات؟
ئایا دەگونجێت هەستین بە کۆگاکردنی کات؟
ئایا دەگونجێت هەستین بە خواستنی  کات؟
ئایا دەگونجێت هەستین بە دواخستنی کات؟

بێگومــان هیچ یەکێك لەمانەمــان لەتوانادا نییــەو نەگونجاوەو وەڵامی هەموو پرســیارەکان (نەخێــر)ە، یەکێك لەئەرکە گرانو قورســەکان ئەوەیە کــەوا خۆمانو خەڵــك فێربکەین چۆن کاتەکانمــان ڕێکبخەیــنو ســودی لێوەربگرین، تاژیانمان پڕلەبەرهەم بێت.

پێویســتە لەســەر هــەر تاکێــك هەندێــك لــە کاتەکانــی بەســەر بەرێت بــۆ بیرکردنەوە لەڕێکخستنی کاتو نەخشەکێشان لەسەر درشتیو وردی خشــتەیەکی کاری ڕۆژانە، کەئەم خشتەیە بەرنامەیەك بێت بۆ ڕێکخســتنی ئیشی ڕۆژانەو هەفتانەو ساڵانە.

بزانە بە لەدەســتدانی ١٥ خولەك لەڕۆژێکدا لەدەســتدانی ١١ ڕۆژە لەســاڵێکدا.. ئەگــەر لــە نەخشــەکەتدا هەفتەیەك یــان دە ڕۆژ دابنێیت بۆ ئەنجامدانی کارێك ئەوا ئەو کاتە دەبات، واتە ئەرکەکان درێــژ دەبنو دەچنەوە یــەك بەپێی کاتی دیاریکراو.

نابێــت کات زینــدان بکەیــن لەکاتژمێــرو ڕۆژ ژمێرو خشــتەکانماندا بەڵکــو دەبێت گیانی دڵسۆزیو خوێن گەرمی بەسەر کارو کردەوەماندا زاڵبێــتو دڵمــان بــەکار خۆشــبێتو کاتمــان خۆشبوێت.

ئێستا لەخۆت بپرسە:

ئایا چۆن کاتەکانت ڕێکدەخەیت؟
ئایا کاتەکانت بەرێكو پێکی بەسەر دەبەیت؟
ئایا توانات لەبەڕێوەبردنی کاتدا چۆنە؟
ئایا نەخشەی کارت هەیە؟
ئایا خشتەی ڕۆژانەت ئامادە دەکەیت؟
ئایا کاتت داناوە بۆ هەر کارێك کە پێویســتە بیکەی؟
ئایا کاتت داناوە بۆ کارو بەرهەمی نوێ؟

بــۆ وەڵامدانەوەی ئــەم پرســیارانەو چەند پرســیارێکی تر فەرمــوو لەگەڵماندابــە ئەم دوو خشتەیەپڕبکەرەوە: ئەگەر سەرکەوتوو بویت ئەوا پیرۆزت بێت  کاتەکانت بەجوانی بەســەر دەبەیت ئەگەر نا مەترسەو مەڕوخێ شوێن ڕێنماییەکانمان بکەوە تاسەرکەوتن بەدەست بێنی.

دووەم: ئایا کاتەکانت بەرێکو پێکی بەســەر دەبەیت؟

پرســیارەکانی ئــەم خشــتەیەی خــوارەوە بەراســتگۆی وەڵام بــدەرەوە... ئەگــەر ســەرکەوتووبوویت لەبەسەر بردنی کاتەکانتدا.. ئەواپیرۆزە، ئەگەر نا.. مەترســەو تێکمەشــکێ ڕێنمای خۆت بکەو نەخشە بکێشە تاسەرکەوتوو دەبیــتو نمرەی باش بەدەســت دێنیت ئەو کات پێت دەڵێین پیرۆزە.

| پرسیار | هەمیشە | زۆر جار | هەندێکجار | بەدەگمەن | بەهیچ جۆرێ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١- ئایا لەجێبەجێکردنی کارەکانتا ئەولەویەت لەبەرچاو دەگریت؟ | | | | | |
| ٢- ئایا ئەو کارەی کە پێویستە لەو ڕۆژەدا بیکەی، ئەنجامت داوە؟ | | | | | |
| ٣-ئایا کارە گرانو نارەحەتەکانت بەبێ دواخستن جێبەجێ دەکەیت؟ | | | | | |
| ٤- ئایا نەخشەی ڕۆژانە دەکێشیو ئەولەویات دیاری دەکەیت؟ | | | | | |
| ٥- ئایا نەخشە ڕۆژانەکەت لەکاتی خۆیدا جێبەجێ دەکەیت؟ | | | | | |
| ٦- ئایا سوودی باش لەکاتی بێ کاری وەردەگریت؟ | | | | | |
| ٧- ئایا کاتی پێویستت داناوە بۆ پلان دانان؟ | | | | | |
| ٨- ئایا کاتە هێمنو لەســەر خۆکانت هەڵدەبژێریت بۆ نەخشەکێشــان لەبری کاتی سەر قاڵیو کارکردن؟ | | | | | |
| ٩- ئایا بەیانیان پێش دەرچوونت لەماڵ دەزانیت یەکەم کارت چییەو لەگەڵ کێدایە؟ | | | | | |
| ١٠- ئایا لیستێکت ئامادە کردووە بۆ زیاتر ٪١٠ی پێشبینیەکانی ڕۆژانەت؟ | | | | | |
| ١١- ئایــا کاتی پێویســتت داناوە بــۆ بەرەو پێشــتر بردنی کارەکــەتو دۆزینەوەی کارو بەرهەمی نوێ؟ | | | | | |
| ١٢- ئایا نەخشەیەکی مادیت هەیە بۆ حسابکردنی کاتەکانت؟ | | | | | |



لەکۆتایدا ئەنجامەکە بەم شێوەیە دەربهێنە:

ژمارەی وەڵامەکانی (هەمیشە) بدە لە ژمارە (٥)، (ژمارەکە)×(٥)= ..............
ژمارەی وەڵامەکانی (زۆرجار) بدە لە ژمارە (٤)، (ژمارەکە)×(٤) = ..............
ژمارەی وەڵامەکانی (هەندێکجار) بدە لە ژمارە (٣)، (ژمارەکە)×(٣) = ..............
ژمارەی وەڵامەکانی (بەدەگمەن) بدە لە ژمارە (٢)، (ژمارەکە)×(٢) = ..............
ژمارەی وەڵامەکانی (بەهیچ جۆرێ) بدە لە ژمارە (١)، (ژمارەکە)×(١) = ..............

---

کۆی گشتی

تێبینی:

★ ئەگەر کۆی نمرەکانت لەنێوان (٥٤-٦٠) بوو ئەوا تۆ (سەرکەوتوویت) کاتەکانت بەجوانی بەسەر دەبەیت .. پیرۆزە.

★ ئەگەر کۆی نمرەکانت لەنێوان (٤٥-٥٣) بوو ئەوا (زۆر باشیت) بەڵام پێویستت بە هەندێ ڕێنمایی هەیە.

★ ئەگەر کۆی نمرەکانت لەنێوان (٣٠-٤٤) بوو ئەوا تۆ هەندێك کێشەت هەیە هەرچەندە (باش)یت، بەڵام بەگوێرەی پێویست نیتو دەبێت خۆت چاکتر بکەیت.

★ ئەگەر کۆی نمرەکانت لەنێوان (١٢-٢٩) بوو ئەوا تۆ بەگوێرەی حەزو ئارەزووت دەجوڵێیتەوە.. بۆیە پێویستت بەخۆ ماندوو کردن هەیە بۆ گۆڕینی هەڵسوکەوتی ئێستات، تابەهۆی بەڕێوەبردنێکی سەرکەوتووانەی کاتەکانتەوە ژیانێکی باشو سەرکەوتوو بەسەر بەریت...

**ئەگەر ژیانم درێژتر بووایە، لەوانەیە هەموو ئەو شتانەم نەوتایە کە پێرم لێدەکردنەوە، بەڵام بە دڵنیاییەوە بیرم لە هەموو ئەو شتانە دەکردەوە کە دەمویست بیانڵێم.**

**«گابریل گارسیا مارکیز»**

**ئەگەردانت نا بە هەڵەکانتدا ئەوسا دەتوانیت بەسەریاندا زاڵبیت.**

**«برندان فرانسیس بیهان»**

# چۆن دەبیتە وتاربێژێکی کاریگەر؟

۳/۳

ن/ ریتشارد دویس خاوەنی خەڵاتێکی جیهانی کە دەدرێت بە نووسەرو وتاربێژە ناوازەکان.

وەرگێرانی بەدەستکارییەوە/سەرنووسەر

**نهێنییەکانی سەرکەوتنی وتاربێژ:**

زۆر جار گوێبیستی رێژنەیەك ئامۆژگاری دەبیت کە خاوەنەکانی دەڵێن: ئەمە نهێنی گەیشتن بە کۆمەڵە سوودێکی بێ وێنەیە وەك: تەمەن درێژی ، سەرکەوتنی خێرا، دەوڵەمەندی، بەڵام لە بواری وتاربێژیدا نهێنی گەلێکی وا بوونی نییە!

بەڵکو تەنها چەند رێو رەسمێك هەیە کە وتاربێژان بەکاری دەهێنن بۆ بەخشینی درامای وروژاندنو سەرنج راکێشان بە وتارەکانیان، لەو رێو رەسمانەش:

١- رێسای (سیانە): وتاربێژەکان لە زووەوە درکیان بە گرنگی ژمارە سێ کردووە بۆ ئەم مەبەستەش ئامرازی رەوانبێژییان داهێناوەو ناویان لێ ناوە (رێسای سیانە) کە بریتییە لە گوزارش کردن لە بیرۆکەو بۆچوونەکان لە چوارچێوەی کۆمەڵەیەکی سیانیدا کە خاوەنی وشەی وەك یەکن لە رووی دەربرینو کاریگەریو رێزمانییەوە، بۆ نموونە: ئەبراهام لنکولن لە وتارێکیدا دەڵێت: (ئەو حکومەتەی حوکمرانی گەل دەکات لە رێگای گەلەوەو لە پێناوی گەلدا، مەحاڵە لەناو بچێت).

یولیوس قەیسەر دەڵێت: (هاتمو بینیمو تێکم شکاند).

فرانکلین روزفلد دەڵێت: (سێ یەکی نەوەکانمان دەناڵێنن بە دەست بەد نیشتەجێیو بەد پۆشاکیو بەد خۆراکییەوە).

ئەو بیرۆکانەی کە بەم شێوە سیانییە رێك دەخرێن، بەردەوام لە زەیندا دەمێننو بە شێوەیەکی بەهێزتر بە عەقڵی گوێگرەوە دەلکێن.

٢- دووبارەکردنەوە: بە تایبەت دووبارە کردنەوەی سەرەتای رستە لەیەکچووەکان، لەو وتارە بەناوبانگانەی کە لە جیهاندا دەنگی داوەتەوە بە درێژایی مێژوو وتارەکەی (د. مارتن لوسەر کینج)ە کە (٨) رستەی بە وشەی (خەونێکم هەیە) دەستی پێکرد.

٣- ئاماژەو زیادەڕەوی (المبالغە): سیناتۆرێکی ئەمریکی ئاوها ئاماژەی بە یاسای نوێی سەرفکردنی بودجە کرد:

(بلیۆنێك لێرەو بلیۆنێك لەوێ، لە پڕ دەتوانین سامانێکی زۆر پێکەوە بنێین).

٤- گواستنەوە: وتاربێژە نایابەکان، زۆر بەجوانیو ئاسانی لە بابەتێکەوە دەگوازنەوە بۆ بابەتێکی تر، لە کتێبو نووسیندا گواستنەوە بەهۆی بەکارهێنانی ناونیشانەوە دەبێت، بەڵام لە وتاربێژیدا بەهۆی راوەستان، بە توندی خوێندنەوەی وشەیەك یان رستەیەکەوە دەبێت.

٥- جوون یەك (طباق): ئەویش بە بەکارهێنانی دوو بیرۆکەی جیاواز، (جون کەنەدی) لە یەکەم وتاریدا دوای هەڵبژاردنی سەرۆك وتی: (پرسیاری ئەوە مەکە کە وڵات دەتوانێت چیت پێشکەش بکات، بەڵکو پرسیار بکە کە تۆ دەتوانیت چی پێشکەش بە وڵاتەکەت بکەیت)؟

**بەکارهێنانی ئامرازەکانی روونکردنەوە:**

زۆر جار هەندێك بابەت هەن ناتوانرێن روون بکرێنەوە بێ بە کارهێنانی (ئامرازەکانی روونکردنەوە).

بەڵام پێویستە لە کاتی بەکارهێنانیدا رەچاوی ئەم خاڵانە بکەیت:

١- تەنها پشت بەو ئامرازانە مەبەستەو دڵنیابە کە وتارەکەت بە جوانی ئامادە کردووە!

٢- مەهێڵە ئەو ئامرازانە کۆنترۆڵی وتارەکەت بکەن، بەڵکو تەنها بۆ بەهێزکردنی بابەتەکانت بەکاریان بهێنە.

٣- لە کاتی گونجاودا بەکاریان بهێنە.

٤- لە کاتی پێشکەشکردنی وتارەکەتدا هیچ بڵاوکراوەیەك دابەش مەکە، چونکە ئەم کارە وا دەکات جەماوەر ئاگایان لە تۆ نەمێنێت.

٥- دڵنیابە کە هەموو ئامادە بووان هۆکارو ئامرازەکانی روونکردنەوە بە جوانی دەبینن.

٦- بارودۆخەکە کۆنترۆڵ بکە: لە کاتی پیشاندانو نمایشدا تەماشای نێوچاوی ئامادەبووان بکە.

کۆتایی هێنان بە وتار:

سەرەتاو دەسپێکی وتار چەندە گرنگە، کۆتایی هێنانیش بە وتارەکە ئەوەندە گرنگە، لەبەرئەوە:

* سەرەتا بڕیار بدە کە چییە ئەو شتەی کە دەتەوێت وتارەکەت بە دەستی بهێنێت، وێرای رەزامەندی ئامادەبووان؟

* ئایا دەتەوێت جەماوەرەکەت کارێك ئەنجام بدات؟

یا قەناعەت بە بیرۆکەیەك بهێنن؟

یا هەستێکی تایبەتیان بۆ دروستببێت سەبارەت بە باتەکەت؟

هەموو ئەم شتانە پەیوەندی بە مەبەستی وتارەکەو بیرۆکەی سەرەکییەوە هەیە. کە هەردووکیان دوو بنەمان کە دەتوانرێت بەهێز بکرێن لە رێگای کۆتاییەکی بەهێزەوە.

زۆربەی کۆتاییەکانیش دەچنە ژێر یەکێك لەم شەش جۆرەی خوارەوە:

١- کورتکەرەوە: تیایدا وتاربێژ گرنگترین خاڵەکانی وتارەکەی کورت دەکاتەوە.

٢- خستنەڕووی خێرا: تیایدا وتاربێژ خاڵە جۆراوجۆرەکانی وتار دەخاتە روو.

٣- داواکاری راستەوخۆ: تیایدا وتاربێژ داوا لە جەماوەر دەکات بە کارێك هەڵسن.

٤- بیرۆکەی سەرەکی: وتاربێژ خاڵی سەرەکی دووبارە دەکاتەوە کە جەمسەری سەرەکی وتارەکەیە.

٥- ئاماژە بۆ خاڵێك کە وتارەکەی بۆ دەگەڕێتەوە (الاشارە بالمرجع): وتاربێژ هەڵوێستێك یا رووداوێك یا شوێنێك دەبەستێتەوە بە وتارەکەیەوە.

٦- کۆتایی هێنانی ئیلهام بەخش: تیایدا






وتاربێژ کۆتایی بە وتارەکەی دەهێنێت بە سەر گوزشتەیەك یا پارچە هەڵبەستێك یا وتەیەکی کاریگەر یا نووکتەیەکی سەیر دوور لە زیادە ڕەوی‌و موبالەغە.

دەبێت ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە کۆتایی هێنان وەکو پێشەکی، زەحمەتە تەنها بەیەك لەو جۆرانەی سەرەوە کۆتایی پێ بێت، بەڵکو کۆتایی هێنانی نموونەیی تێکەڵە لە چەند جۆرێك لەو جۆرانە، پێویستە کاتێك بیر لە کۆتایی دەکەیتەوە بە شێوەیەکی مەنتیقی‌و داهێنەرانە بیر بکەیتەوە.

**تەماشاکردن‌و پیاچوونەوەی وتار:**

دوای ئەوەی لێ دەبیتەوە لە کۆکردنەوەی زانیاری پێویست‌و دانانی نەخشەیەکی سەرەتایی بۆ وتارەکەت‌و نووسینەوەی، پێویستە لەسەرت هەڵسی بە پیاچوونەوەیەکی گشتی‌و وردی هەموو ئەو شتانەی نووسیوتە، بۆ ئەم مەبەستەش پێنج بوار کە پێویستە ڕەچاویان بکەیت لە کاتی پیاچوونەوەی وتارەکەتدا:

١- پێداچوونەوەی ناوەڕۆك: بۆ هەموو ڕستەو ئامارو زانیارییەکی خوازراو پێداچوونەوە ئەنجام بدەو دڵنیابە لە وردی زانیارییەکان، بە ناوەڕۆکی وتارەکەتدا بچۆرەوەو دڵنیابە کە مەبەستی خۆی پێکاوە.

٢- پیاچوونەوەی ڕێکخستن: دڵنیابە لەوەی کە وتارەکەت نمایشێکی ڕێك‌وپێکی گونجاوی مەنتیقییەو تەنها کۆمەڵە زانیارییەکی پرش‌و بڵاو نییە.

٣- پێداچوونەوەی شێواز: هەمیشە لە یادت بێت کە ڕستەی کورت خوێندنەوەی ئاسانترە لە ڕستەی درێژو ڕستەی سادەش لە ڕستەی ئاڵۆز.

٤- پیاچوونەوەی زمان: زیادەڕەوی مەکە لە بەکارهێنانی زمانی زاراوەیی یا لە وشەی درێژدا، زیاد لە پێویست.

٥-پیاچوونەوەی ڕێزمان: بە تەنها پەیوەست بوون بە ڕێساکانی ڕێزمانەوە وەکو پێویست وتارێکی نموونەیی لێوە پەیدا نابێت، بەڵام کەوتنە نێو هەڵە ڕێزمانیەکانەوە دەبێتە هۆی شێواندنی وتارەکە، کە دەکرێت بێ ئەو هەڵانە وتارێکی باش بوایە.

★ ڕێسایەکی ئاڵتوونی: باشترین وتاربێژانی جیهان پشت بەرەوانبێژی‌و تەرکیزو ڕوونی بیرۆکەو ئامادەکردنێکی باش دەبەستن. بە پێچەوانەی زۆر کەسەوە وتاربێژی تەنها بەهرەیەك نییە، بەڵکو خوێندنەوەو موتاڵاکردن‌و ئامادەیی‌و ئازایەتی‌و هیممەت‌و ئیرادەیە، هەموو کەسێکیش دەتوانێت ببێتە وتاربێژێکی کاریگەر ئەگەر زمانیشی زۆر ڕێك نەبێت‌و دڵیشی زۆر ئازا نەبێت، بەمەرجێك هەوڵبدات‌و خۆی ڕابهێنێت!!

ئەمەش چەند ئامۆژگارییەکە دەتگەیەنێتە لوتکەی وتاربێژ:

١- بخوێنەوە بەردەوام بێ ڕاوەستان: هەموو بابەتێك بخوێنەوە بە تایبەت کتێبی کەلەپورو نووسەرە گەورەکان چونکە شێوازی ئەوان ڕەسەنایەتی تێدایەو هێزو پتەوی لە نووسینەکانیاندا بەدی دەکرێت.

٢- هەوڵبدە بە زیاتر لە زمانێك بخوێنیتەوە: ئەگەر نەتتوانی ئەم کارە بکەیت، هەوڵبدە زۆرترین دەقی وەرگێردراوو فەرهەنگ‌و پوختەی کتێبەکان بخوێنیتەوە.

٣- خۆت تەنها لە بواری پسپۆری خۆتدا گەمارۆ مەدە: چونکە وەك دەڵێن: زانا ئەو کەسەیە کە زۆر لە بارەی کەمەوە دەزانێت، بەڵام مرۆڤی فەرهەنگی (موسوعی) ئەو کەسەیە کە کەم لە بارەی زۆر شتەوە دەزانێت، وتاربێژیش پێویستی بە بیرێکی فراوان‌و ڕۆشنبیرییەکی دەوڵەمەند هەیە، چونکە ئەو زانایەی کە تەنها لە بوارەکەی خۆیدا شارەزایە تەنها دەتوانێت لە بواری پسپۆری تەسکی خۆیدا قسە بۆ خەڵکی بکات‌و زۆر جاریش کاتێك قسە دەکات بە دەگمەن وتاربێژێکی باشە!

٤- وتەو پەندو ئامۆژگاریی‌و قسەی نەستەقی جوان کۆبکەرەوە: پێویستە وتاربێژی نایاب گەنجینەیەکی گەورەی پڕ لە نهێنی‌و زانیاری گرنگی هەبێت بۆ ئەوەی هەر کاتێك پێویستی پێ هەبوو بەکاریان بهێنێت.

٥- بخوێنەوەو گوێبیستی وتاربێژە بەناوبانگەکان بە: زۆر کتێب‌و کاسێت هەن کە هی وتاربێژە بەناوبانگەکانن، بیان خوێنەوەو گوێیان لێ بگرەو سودیان لێ وەرگرە.

٦- فێری خوێندنەوە بە بە دەنگی بەرز: بۆ ئەوەی زمانت پاراو بێت‌و وشەکان جوان بخوێنیتەوە.

٧- لاسایی مەکەرەوە: بەردەوام لەسەر سروشتی خۆت بەو هەرگیز کۆپی کەسانی تر مەبەو بە زمان‌و شێوازی خۆت بدوێ.

ئێستا تۆ لەسەر مینبەر یاخود شانۆیت بەرامبەر جەماوەرەکەت ڕاوەستاویت‌و میکرۆفۆنەکەت لە بەردەمەو ئێمەش چاوەڕوانی زایەڵەی دەنگی زوڵاڵی تۆین!!

بێ گومان وتەکانی سەرەتا سەختن، بەڵام پاش چەند ساتێك وشەکانت لە هەموو کون‌و قوژبنێکی هۆڵەکەدا دەنگ دەداتەوە.

دەتوانیت؟ ئەی بۆچی نا!!

# کێشه و بڕیار

وەك بایەخدانێکی زیاتر بە واقیعی ئەمرۆی بواری کارگێری و بازارسازی (بڕیار) لە دووتوێی گۆشەیەکی نوێدا «کێشەو بڕیار» هەلدەستێت بە خستنە رووی کێشەیەك لەهەر ژمارەیەکداو هەولدەدات چارەسەری نموونەیی بۆ ئەو کێشەیە دیاری بکات، بۆ ئەوەی دواتر خاوەنی کێشەکە بڕیاری سەرکەوتووی خۆی بدات.

بۆ زیاتر ئاشنابوونی هەمووان و سوودوەرگرتن لە بۆچوون و رای جیاوازی یەکتری، بۆ گەیشتن بە بڕیارێکی سەرکەوتوو دەرگای «کێشەو بڕیار» کراوەیە بۆ هەر چارەسەرێك کە تۆی خوێنەر بە پەسەندو شیاوتری دەزانیت.

م. ڕێباز

هەموو رۆژێك لە سەرەتای رابوونییەوە (گۆهدار) بیر لە خشتەی کاری ئەو رۆژەی دەکاتەوە، بۆ چەند ساتێك میکانیزمی جێبەجێکردنی ئەرکەکانی دەکاتەوەو ریز بەندیان دەکات بە پێی گرنگترین و گرنگ و ئاسایی، هەرچەند کارەکانی زۆرن بەلام بیرکردنەوەیەکی کارگێری ورد، وایکردووە کە سەیدا (گۆهدار) سەرکەوتوو بێت لە بەرێوەبردنی کارەکانیدا.

گۆهدار لە دوای مردنی باوکییەوە ئەرکی بەرێوەبردنی کۆمپانیای (بابی گۆهدار) ی گرتۆتە ئەستۆ، بەشێکی کۆمپانیاکە لە بازرگانی شیش و چیمەنتۆ تایبەتمەندە، بەشێکی تری کۆمپانیا کاری بەلێندەرایەتی جێبەجێدەکات، جگە لە بوونی سێ کارگەی دەرگاو پەنجەرەی پلاستیك و ئەلەمنیۆم، کارگەی ئاسنگەری، کارگەی بلۆك.

گۆهدار لە بەسەر کردنەوەی پرۆژەکانیدا خشتەی رۆژانەی هەیەو بە پێی پێویست چاوی بەکارمەندەکانی دەکەوێت و کۆبوونەوە لەگەل بەرێوەبەرەکانیدا دەکات.

شەش مانگ بەر لە ئێستا، گۆهدار گرێبەستێکی لەگەل حکومەتی هەرێم مۆر کردووە بۆ دروستکردنی شارۆچکەیەکی گەشت و گوزاری لە پارێزگای (دهۆك)، ئەم کارە بە هاوکاری و پشکداری کۆمپانیای (تیوربۆ تەعەهود)ی تورکی ئەنجام دەدرێ کە لەبواری دروستکردنی شاری نیشتەجێبووندا پسپۆرە. کۆمپانیای (بابی گۆهدار) بۆ ئەو کارە باش ئامادەیەو سەرمایەی پێویستی بۆ دابینکردووەو ستافی تایبەتیشی بۆ دیاری کردووە. لەبەرئەوەی یەکەمجارە لەگەل کۆمپانیایەکی ناوداری تورکی کاری هاوبەش بکەن، (گۆهدار) مەبەستێتی ئاگاداری دوو تەوەر بێت، یەکەم: ئاگاداربوون لە چۆنیەتی کرین و سەرفکردن لە پرۆژەکەدا، بۆ ئەوەی دلنیابێت لە شەفافیەتی بەرێوەبردن.

دووەم: سوود وەرگرتن لە شارەزایی و چۆنیەتی کارکردنی کۆمپانیا تورکیەکە، ئەمەش دەستکەوتێکی مەعنەوی زۆر باشە بۆ کۆمپانیای (بابی گۆهدار).

بۆ ئەم ئەرکانە (عەمۆ سەرکیس) کاندید کراوی گۆهدارە بۆ بەرێوەبەری ستافی تایبەت بە کۆمپانیاکەیان، مام سەرکیس یاخود (باوکی ستیفن) ژمێریارێکی وردو شارەزایە، خاوەن کەسێتییەکی متمانە پێکراوەو توانایەکی باشی بەرێوەبردنی هەیە، دلسۆزی و متمانەی بەرادەیەکە کە گۆهدار سەفەرەکانی بۆ دەرەوەی ولات بێ خەمی بەجێهێشتنی پرۆژەکانی ئەنجام دەدات.

ئەم متمانەیە تازە نییە، بەلکو درێژەی ئەو پەیوەندییەیە کە لە نێوان باوکی گۆهدارو مام سەرکیس دا هەبووە، هەمیشە باوکی بە گۆهداری دەوت: هەتا ئەبو ستیفن کلیلی قاسەکانی ئێوەی لابێت، ئەوا پارەکانتان کەم ناکات، کاندید کردنی مام سەرکیس بۆ ئەو کارە دەرەنجامی ئەو مێژووە پاکەی (مام سەرکیس)ە کە لەگەل ئەو بنەمالەیەدا کاری کردووە، بوونیشی لەو پرۆژەیەدا زامنی گرتنە دەستی جلەوی پرۆژەکەیە لە لایەن کۆمپانیای (بابی گۆهدار)ەوە، بەبێ ئەو واتە باوکی ستیفن، گۆهدار ناتوانێ شانکێ لەگەل کۆمپانیایەکی ئەزموونداردا بکات.

بەر لە سێ مانگ کورە خۆشەویستەکەی مام سەرکیس هەروەها هاورێی تەمەنی منداڵی گۆهدار، خۆی و هاوسەرەکەی بە کارەساتی ئۆتۆمبێل لە رێگای (دهۆك- موسل) گیانیان لە دەستدا. ئەم رووداوە غەمێکی زۆری خستە نێو دلی هەموویان، ئەوەی پەژارەکە قورستر دەکات هەردوو منالەکەی (ستیفن)ە کە بۆ هەمیشە بێ بەش بوون لە سۆزی باوك و نازی دایك.

ئێستا دوای سێ مانگ، غەمەکانی گۆهدار چەند بەرابەر زیادی کردووە، کاریگەری رووداوەکە بە جۆرێکە کە عەموو سەرکیس بێزار بووە لە ژیان، ئێستا باشترین چارە لای عەموو سەرکیس بۆ سوککردنی باری غەمەکانی پەنا بردنە بۆ (مەی)، مام سەرکیس ئاسوودەترین کاتی ئەو چەند کاتژمێرەیە کە لە ژووانگەی سەر مێزەکەیدا بە دیداری پێکەکان شاد ئەبێت. هەرچەند ئەم دانیشتنانە بە ژیانی مام سەرکیس نامۆ نییە، بەلام ئێستا گەیشتۆتە رادەی بەد مەست بوون و سنووری ئاسایی بەزاندووە بە جۆرێك کە نایەوێت بە رۆژیش لەو ئەتمۆسفێرە دوور بکەوێتەوە، ئەم تێکشکانە ئەندامانی خێزانەکەی (مام سەرکیس) یشی بێزار کردووە.

ترسناکی ئەم حالەتەی مام سەرکیس بۆتە کۆسپێکی گەورەی بەردەمی پرۆژەکەی (گۆهدار)، بە تایبەت کە بڕیاری دابوو ئەو بکاتە سەرۆکی دەستەی کارگێری پرۆژەکە. ئێستا خەونەکانی گۆهدار لێلن، چونکە پرۆژەیەکی لەو جۆرەو لەگەل کۆمپانیایەکی تورکیدا، بە قازانج بۆ کۆمپانیای (بابی گۆهدار) کۆتایی نایەت گەر (عەمۆ سەرکیس) کارای یاریدەدەری هاوکێشەکە نەبێت، ئەو چانسەش بۆ گۆهدار نەماوەتەوە کە بڕیاری پاشەکشە بدات، چونکە پەیوەست بوونێکی ماددی لە بەلێن نامەکەدا هەیەو دەبێتە زەرەرێکی زۆر بۆی. گۆهدار هیچ سوودێك لە عەموو سەرکیس نابینێت گەر بەم جۆرە بێت، هاوکات بێ عەموو سەرکیس ناتوانێ بەرێك و پێکی کارەکانی رابگرێت و حساباتەکانی روون بێت.

ئایا چارەسەر هەیە بۆ ئەم کێشەیە؟ ئایا هیوای بەوە هەبێت کە مام سەرکیس بگەرێتەوە دۆخی جاران؟ چۆن؟ گۆهدار ئامادەیە بە هەر نرخێك بێت چارەسەر پەیدا بکات.

(بۆ کردنەوەی گرێ، سەیری جەمسەرەکانی پەتەکە بکە نەك تەنها گرێ یەکە):

حالەتێکی لەو جۆرە لای کەسێکی وەك گۆهدار پێویستە شتێکی ئاسایی بێت، لانی کەم زیاتر لە پەنجا کەس لە پرۆژەکانی ئەودا کاردەکەن کەواتە ئاساییە گەر

ئەو کێشانە دروست ببن، بەڵام ئاسایی نییە کە گۆهدار بۆ هەر پرۆژەیەك پلانی ئیداری وردی نەبێت و لەگەڵ هەر پلانێکدا پلانی (B) نەبێت، مەبەستم لەوەیە گەر گۆهدار پلانی (A) هەیە بۆ پرۆژە تازەکەی، پێویستە پلانی (B) هەبێت بۆ حالەتی لە ناکاو، بۆ نموونە: لە حیاتی (ستیفن) کە لەو رووداوەدا گیانی لە دەستدا، گەر عەمۆ سەرکیس خۆی ببوایە، ئەو کاتە گۆهدار چی دەکرد؟ خۆ ئێستا ئەگەر هیوایەك هەیە بە چاکبوونەوەی باوکی ستیفن ئەو کاتە ئەو هیوایەش لەگەڵ مام سەرکیسدا دەچووە ژێر خاك!

چەقی قورسایی کێشەکە لەوەدایە کە کەسێکی وەك (سەرکیس) بەو هەموو توانا و لێهاتووییەوە دەستی لە ژیانی خۆی هەڵگرتووە، ئاسایی بوو گەر پێش ئەو رووداوە مەست دەبوو، بە تایبەت ئەو کە لە کەلچەرێکی ئاشنا بەو شێوە ژیانە هاتووە، بەڵام بەد مەست بوونی هێڵێکی سوورە نەك تەنها بۆ گۆهدار بەڵکو بۆ خانەوادەکەی و بگرە خودی خۆشی.

لەبەرئەوەی ناسیاوییەکی لە مێژینە لە نێوانیاندا هەیەو هەروەها گۆهدارو (ستیفن)ی کوری مام سەرکیس هاوڕێی نزیك بوون، کەواتە پێویستە لە لایەك وەك بەرپرسیارییەکی کۆمەڵایەتی هاریکاری بنەماڵەی مام سەرکیس بکات تاوەکو لەو خووەی رزگاری بکات، لە لایەکی تریشەوە کە (بزنس)ە ئەوەیە کە مام سەرکیس بڕبڕەی پشتی کارەکانی کۆمپانیای (بابی گۆهدار)ە، کەواتە وەك هەر ئەرکێکی تری (بزنس) پێویستە گۆهدار لە هەوڵی راستکردنەوەی رێڕەوی ژیانی مام سەرکیس دابێت، بەڵام چۆن؟!

پێشنیارم بۆ سەیدا (گۆهدار) ئەوەیە کە پشت بە خانەوادەی مام سەرکیس خۆی ببەستێت بۆ چارەسەری بنەرەتی کێشەکە، لە زاری ئەوانەوە رێگەیەکی نوێ بۆ چارەسەر بدۆزێتەوە، هاوشانی خانەوادە هاوڕێکانی مام سەرکیسیش دەبنە یارمەتیدەرێکی باش بۆ گەیشتن بە چارەسەر، دڵنیام (ئایین) یش رۆڵێکی ئیجابی هەیە لەو مەسەلانەدا، کەواتە گۆهدار دەتوانێت نزیکترین (قەشە) راسپێرێ کە هاوکارییان بکات بۆ ئەو مەبەستەی کە بە کۆمەڵ دەیانەوێت پێیان بگەن، لێرەوە دەردەکەوێت رێگە چارەکانی بەردەم گۆهدار کەم نین، تەنها کەمێك وردبوونەوە لێی زنجیرەیەك شێوازی چارەسەر هەیە:

دوای ئەوەی کاریگەری ئەو کۆکارییە دەرکەوت، پێشنیاری ئەوە دەکەم کە گۆهدار گەشتێکی تورکیاو قوبرس بۆ خۆی و مام سەرکیس ساز بدات، تاوەکو کاریگەری خەمەکانی مام سەرکیس کەم بکاتەوە، هەر لەوێشەوە سەردانی کۆمپانیای (تیۆربۆ تەعەهود) بکەن، تا لە ئەنجامی یەکتر بینین مام سەرکیس باشتر بزانێت کە ئەرکی سەرشانی کەم نییەو گۆهدار زۆر پێویستی پێیەتی.

دوایین پێشنیار گۆهدار دەتوانێت لە ئێستاوە پشکێك لەو پرۆژەیە ـ کە شایەنی هاوڕێیەتی خۆی و (ستیفن) بێت ـ تەرخان بکات بۆ دوو منداڵەکەی (ستیفن) تا لە دوا رۆژدا وەك دەستکەوتێك سوودی لێ وەرگرن، بەم هەنگاوە گۆهدار چەند ئامانجێك دەپێکێت:

یەکەم: بە فیعلی دڵی مام سەرکیس شاد دەکات و وەك راچەنین دەبێت بۆی، تاوەکو وەك جاران و بگرە زیاتریش هەوڵ بدات بۆ سەرکەوتنی پرۆژەکە.

دووەم: بە کردار وەفای خۆی بۆ (ستیفن) ی هاوڕێی دەسەلمێنێ.

سێیەم: بۆ چوونم وایە بۆ داهاتوویەکی دوور، واتە نەوەی سێیەم و چوارەمی کۆمپانیا، دوو کادری دڵسۆز دەستەبەر بوون ئەوانیش دوو منداڵەکەی (ستیفن)ن.

# راپۆرت

وەهاب حەسیب - کۆلێژی بازرگانی



**راپۆرت بریتیە لە:**

١- یەکێکە لە هۆیەکانی پەیوەندیکردن لەنێو رێکخراوەکاندا.

٢- پیشاندانی راستیەکان و رووداوە تایبەتیەکانی مەسەلەیەکی دیاریکراوە، پیشاندانێکی شیکارانەیە بەشێوەیەکی ئاسان لەگەڵ وەبیرهێنانەوەی پێشنیارو ئامانجەکان کە لێکۆڵەرەوە (باحث) پێیان دەگات بە مەبەستی:

* ئاگادارکرنەوەی کەسانی تر بەراستییەك.
* پیشاندانی پێشنیارو ئامۆژگارییە لەبەر رۆشنایی دەرئەنجامی یان راڤەکردنی باسێکی تایبەت یان کێشەیەك ئەوەش بریتییە لە یاداشت.

یاداشت: بریتییە لە کورتە نامەیەك داتاکان و راستیەکان لەئیدارەیەکەوە دەگوێزێتەوە بۆیەکێکی تر، کە مشتومڕلەسەر باسێك دەکات، دوورە لە تەم و لێڵ و دامەزراوە گەورەکان بایەخی پێدەدەن لەبەرئەوەی نوسراوەو زارەکی نییە.

جۆرەکانی راپۆرت:

١-راپۆرتی خولاوە (التقرير الدوري): بەشێوەیەکی رێکخراو پێشکەش دەکرێت، دوای ماوەیەکی دیاریکراو (رۆژانە، هەفتانە، مانگانە، یان دوای کۆتایی هاتنی ئەو ماوەیەی ئیدارە دەستنیشانی کردووە)ئەم راپۆرتە کورتکراوەی هەموو ئەو چالاکیانەیە رێکخراو یان دامەزراوە(المؤسسات) پێی هەڵساوە لە ماوەیەکی دیاریکراودا، پێشکەش بەلایەنی پەیوەندیداردەکرێت بەشێوەیکی دروست.

٢- راپۆرتی پشکنین (الفحص): راپۆرتێکە راڤەی ئێستاو داهاتوو دەکات، بۆ ئەوەی ببێت بەبناغەیەك بۆ ئەو بڕیاروچارەسەرانەی سیستمی بەڕێوەبردن لە داهاتوودا کاری لەسەردەکات.

٣- راپۆرتی ئامۆژگاری (التوصية): ئەو جۆرەراپۆرتەیە ئامۆژگاری و پێشنیاروچارەسەری گونجاو پێشکەش دەکات. واتە پابەند نابێت تەنها بە پێشکەشکردنی داتاو شیکردنەوەی، مەبەست لێی چاککردنی پلانێکی دیاریکراو، سیستەمێکی کار، یاخود چارەسەری کێشەیەکە لەکێشەکان...

٤- راپۆرتی راپەراندن یان بەڕێوەبردنی کار (سير العمل):

ئەو راپۆرتەیە، داتاکان دەخاتە روو بەمەبەستی راپەراندنی کردارێك، پرۆژەیەك، وێنەیەکی راستگۆیانەی مێژووی ئەو کردارە یان پرۆژەیە دوای تەواوبونی، مەبەستی سەرەکی ئەم جۆرە راپۆرتانە پێدانی لایەنی پەیوەندیدا یان ئیدارەی پرۆژەکەیە بە داتاو ئەو بەشانەی لەپرۆژەکەدا تەواوبوون.



باوکی لزا

# گرفتەکانی بزنس یان بزنسی گرفتەکان

## بەزمانێکی سادە

بێگومـــان لەگەڵ خوێندنەوەی سەرباســەکە هــزرت بۆ کۆمەڵێــك لایەنی بزنـــس یان چەند جۆرێك گرفت دەچێت، یان گریمانەی ســێیەم - کە بەهێزترینیانە- تێکەڵکردنی (بزنس+ گرفت) راستەوخۆ کۆمەڵێك ڕەهەندی هاوبەشی نێوانیان دێتەوە یادت، با زۆر ســەرقاڵت نەکەم راستەوخۆ دەچمە ناوەرۆکەکەوە.

گەر بپرســم لە وڵاتی خۆمانــدا گرفتەکانی بزنس چین؟

بــێ یــەك و دوو چەندینــم بــۆ ریــز بەند دەکەیت، کەمی ســەرمایە، قورسی ڕەواجدان بە کاڵاکەت، ســەر ئێشەی ســاغ کردنەوەو فرۆشتن، نەهامەتیەکانی شــانکێ (منافســە) کــردن، بێ ســەروبەری کات بەســەر بــردن، تامەزرۆیی بۆ کارمەنــدی دڵســۆز، ....چەندینی تــر کە دڵنیام ئێستا لە یادی تۆدا هەن و من لە بیرم نیە.

ئەگــەر پرســیاری دووەمت ئاراســتە بکەم: بزنســی گرفتەکان چین؟ لەوانەیە لەمەدا هاورا نەبین، ئایا گرفت کاڵا یا خزمەتگوزارییە تاوەکو لە ژێر چەتری بزنسدا جێیان ببێتەوە؟ ناشمەوێ وەك ڕەوان بێژێك (کنایە) بەکاربهێنم مەبەستم لێی جەهل، دواکەوتویی، گەندەڵی، تلیاك یان هەر شتێکی تر بێت، کە بۆ کۆمەڵگا دەبنە گرفت.

دەمــەوێ بڵێــم ئــەو مۆدێلــەی لە بــازاری ئەمــرۆی وڵاتــی خۆمانــدا دەبینــرێ لە جۆری مامەڵــەو هاوبەشــی کــردن و جیابوونــەوەو بنیاتنانــی پرۆژەیــەك، وەبەرهێنــان و......، بریتییە لە بازرگانــی کردن بە گرفتەوە، ئەوەی ئێمە ئێســتا پێی دەڵێین گرفت، خۆی لە خۆیدا قەیرانــە کە توێژی بازرگانــی ئێمەی تیا ئەژی، لــە بچووکترینیانــەوە تــا دەگاتــە بازرگانە نێو دەوڵەتیەکانمــان. ناکرێ بڵێــین هەموو پیاوێکی کارمان لــەو گرفتانەدا دەژین، بەڵام زۆرینەیان و بــە تایبــەت بازرگانــە موحافیــز کارەکان لەو جوغزەدا خول دەخۆن.

کاتێــك دەڵێــم موحافیــز کار مەبەســت ســووکایەتی نییە، ئەو موحافیز کاریەش مەرج نییــە ڕەنگ بداتــەوە لە ڕوو کەشــەکانی ژیانی بازرگانەکەدا، لە مۆدێلــی ئۆتۆمبێلەکەی، جل و بەرگــی، خانــوو نــاو ماڵەکــەی، یــان دیکۆری ئۆفیســەکەی. ڕووکەشــەکان (رصیــد) نییە بۆ ئــەوەی بڵێی فڵانەکــەس بازرگانێکــی چالاکە، یاخود پارەدارێکی بە توانایە، نەخێر، نموونەش بۆ ئەوە بوونی چەندین کەســی بە ناو بازرگان و خــاوەن کۆمپانیایە کە ڕۆژانــە چەندین (میس کۆڵ) لەسەر شاشەی مۆبایلەکەی هەیەو ژمارەی خاوەن قەرزەکانن و داوای پارەکانیان دەکەن، بەڵام کە ســەیری ئۆتۆمبێل و جل و بەرگ و ناوماڵیان و بگرە خوانی ئەو داوەتانەش دەکەین لە شــەواندا بۆ دۆســت و ئەحباب سازی دەکەن، وێنای ئەوەت لا دروســت دەبێــت کە زیاتر لە ســەدان دەفتەر دۆلار لە هەگبەی ئەودا هەیە.

بە هەر حاڵ بۆ ئەوەی زۆر ســاناتر بابەتەکە روون ببێتــەوە وەڵامــی ئــەم چەند پرســیارە یارمەتیدەرمانە:

١- چەنــد بازرگانمان هەیە نەوەدو نۆ هەوڵی بۆ زیاد کردنی پارەکەیەتی، بەڵام یەك هەوڵی بۆ وەبەرهێنانێکی دروست نییە لە وڵاتدا؟!

٢- چەند بازرگانمان هەیە تا ئێســتاش هیچ پەیمان نامەیەك لە نێوان خۆی و هاوبەشەکانیدا نییە، لە کاتێکدا سەرمایەیان زیاترە لە چەندین ملیۆن دۆلار؟!

٣- چەند بازرگانمان هەیە هەمیشە وا دەزانێ هاوبەشــەکەی فێڵــی لــێ دەکات و کڵاو دەنێتــە سەری، بەڵام تا ئێستا ڕووبەڕوو پێی نەوتووەکە تۆ تەڵەکە بازیت؟!

٤- چەند بازرگانمان هەیە تا ئەم چرکەیەش لەســەر بنەمای متمانە مامەڵە لەگەڵ فاتوورەی کریــن و فرۆشــتنی خۆیــدا دەکات، جــا ئایــا مەسەلەکە متمانەیە یاخود دڵی نایە ژمێریارێك دامەزرێنێــت لای خۆی مانگانە (٥٠٠$)ی بداتێ،

لە كاتێكدا گەر ئەو بڕە پارانەی لە ئەنجامی ئەو حاڵەتەدا تیاچوون زیاترە لە دەفتەرێك دۆلار؟!

٥- چەند بازرگانمان هەیە كە وڵاتەكەی خۆی كردۆتە سەرمونێلكی وڵاتانو كام شتەی خراپە، لە هەرێمی كوردستان ساغی دەكاتەوە، لە كاتێكدا گەر ورد ببینەوە وەك یەكێك لە بازرگانەكان دەڵێت: رەفتاری لەو شێوەیە تەنها دوو مانای هەیە: یان ئەو كەسە (گێل)ە كە كاڵای خراپ هاوردە دەكات، یاخود خائینە بە گەلو وڵات؟!

٦- چەند بازرگانمان هەیە كە لەگەڵ نەمانی خۆیدا، یەكسەر سەروەتو سامانەكەشی نامێنێت، لەبەر ئەوەی نەیتوانیوە لە ئاستی بوون بە كۆمپانیادا كار بكات؟!

٧- ئەی چەند كۆمپانیامان هەیە چەندین ساڵە ناوی كۆمپانیای هەیە بەڵام تا ئێستا هیچ هەنگاوێكی عەمەلی نەبووە كە وەك كۆمپانیا كارەكانی خۆی رێكبخات، بەڵكو تەنها دوكانێكی ناو بازاری شێخەڵلا یان شەقامی كاوە یاخود بازاری جگەرەكە، بەڵام بە گەورەییو بە ناوی كۆمپانیاوە؟!

٨- چەند بازرگانمان هەیە: ئەگەر هاوبەشەكەی یاخود كارمەندەكەشی چەندین كاری باش ئەنجام بدەن ناڵێت: دەستت خۆش! بەڵام ئەگەر ئەنجامی كارێكیان خراپ بێت ئەوا دەهۆڵی بۆ ئەكوتێ؟!

٩- چەند بازرگانمان هەیە تەنها كاری لاسایی كردنەوەیە، هەر كاڵایەك بازاری هەبێت، بێ وردبوونەوەو دیقەت را ئەكات هەمان كاڵا دەهێنێت، بەڵام ئەگەر سەد جار پێی بڵێن بۆ كاڵا یان پرۆژەیەكی نوێ، جورئەتی نییە بۆی، كاتێكیش یەكێك كارێكی نوێ دەكاتو سەركەوتوو دەبێت تیایدا، ئەم ئیرەیی پێ دەبات؟!

١٠- چەند بازرگانمان هەیە: تا ئێستاش وا دەزانێت كروزانەوەو باسكردنی نەبوونی بازار باشترین عەبایە كە دەستكەوتەكانی خۆی پێ داپۆشێ لەبەر چاوی خەڵك؟!

١١- چەند بازرگانمان هەیە: ئاواتە خوازە بۆ ئەوەی بەردێك لە ئاسمان بكەوێتە خوارەوە تاكو خەتاكەی بخاتە پاڵ حكومەت، لە هەمان كاتدا چەند بازرگانیشمان هەیە گەر پێی بڵێی بەری چاوی حكومەت كلی پێوەیە، ئەوا هەر ئەوەیە شار بەدەرت ناكات؟!

١٢- چەند بازرگانمان هەیە بەناوی موسوڵمانێتییەوە، جلو بەرگێك یاخود سەیرانێك یان ئێوارە جوونە دەرەوەیەك بە خێزانەكەی رەوا نابینێت، هاوكات چەند بازرگانیشمان هەیە كە ئاگای لە رەوشی ژیانیماڵو خێزانی نەماوە، لە كاتێكدا هۆكاری هەردوو حاڵەتەكە تەنها زۆر كردنی پارەكەیە، نە ئایینو دینداری نە ئازادیو پێشكەوتن؟!

١٣- چەند بازرگانمان هەیە تا ئێستا وا دەزانێت بازرگانی تەنها بۆ پارە كۆكردنەوەیەو خزمەتیش تەنها مانای پارە سەرفكردنە! تا ئێستا نەیتوانیوە لەوە تێبگات كە ئەشێ بازرگانی هەر دوو خاڵی (خزمەتو قازانج)ی تێدا بێت؟!

# ستراتیژیەتی بەرهەمهێنان بەكەمترین نرخ



هیوا رفیق - كۆلێژی كارگێڕیو ئابوری

وەك ئاشكرایە مەبەست لە دروستبوونی هەموو كەرتێكی گشتی پێشكەشكردنی خزمەتە بە خۆڕاییو بەبێ بەرامبەر بە خەڵكی، چونكە ئەم كەرتە لە لایەن حكومەتەوە بەڕێوە دەبرێت، بەڵام بە پێچەوانەوە مەبەست لە دروستبوونی كەرتی تایبەت بە دەستهێنانی قازانجە لە رێگەی پێشكەشكردنی ئەو شمەكو خزمەت گوزارییانەی كە بەرهەمی دەهێنێت، هەر بۆیە كارگەو كەرتە تایبەتیەكان هەوڵی بەرهەم هێنانی شمەكو كەلو پەلێك دەدەن كە پێویستیەكانی بە كاربەران پڕ بكاتەوەو لەگەڵ ئارەزووەكانیاندا بگونجێت، چونكە بەكاربەر هەوڵی ئەوە دەدات بۆ دەستكەوتنی پێویستییەكانی بە كەمترین نرخو باشترین جۆر، بۆ ئەوەی بەكاربەر هان بدرێت بۆ كڕینی ئەو شمەكو كەلوپەلانەی لە بازارەكاندا هەیە، نەك هەڵسان بە كڕینی شمەكو كەلو پەلی هاوشێوەی كارگەیەكی تر.

كەرتی تایبەتو كارگەكان دەبێت كۆمەڵێك رێگە بگرنە بەر بۆ كەمكردنەوەی نرخی تێچووەكان بە شێوەیەك ئەو كەمكردنەوانە كار نەكاتە سەر جۆرو چاكی شمەكو پێداویستییەكان، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- پێویستە لەسەر بەڕێوەبەری كارگە هەوڵ بدات هەموو كارمەندانو فەرمانبەرانی كارگەكەی تێبگەیەنێت لە كەمكردنەوەی نرخەكانو مانەوەی جۆریەتیو چاكی بەشێوەیەكی باشتر.

٢- نزیكی كارگە لە بەكاربەرانەوە، بۆ ئەوەی نرخی تێچوونی گواستنەوە كەم بكەوێت لەسەر كارگە، چونكە ئەگەر نرخی گواستنەوە زۆر بێت بێ گومان نرخی شمەكو خزمەت گوزارییەكان بەرز دەبێت، بۆیە هەتا دەتوانرێت پێویستە كارگەكان نزیك بێت لە بەكاربەرانەوە.

٣- دانانی پلان بۆ كڕینی كەرەستەو ماددە سەرەتاییەكان بە نرخێكی هەرزان كە بە شێوەیەك كارنەكاتە سەر بەرهەمە سەرەكیەكە، واتە لە جۆری چاكیەتی بەرهەمەكە كەم نەكاتەوە.

٤- هەوڵدان بۆ پێشكەشكردنی بەرهەمەكان بەبێ جوانكاری زۆر، واتە گرنگی نەدان بە لایەنی (كەمالیات) بە شێوەیەكی بەرفراوان چونكە ئەمەش دەبێتە هۆی تێچوونی زۆرو بەرزبوونەوەی نرخی بەرهەمەكە، ئەمەش زۆر جار هیچ سوودێكی نابێت جگە لە بەرزبوونەوەی نرخەكان.

# بەراوردێك لە نێوان کەسایەتی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییدا

عوسمان سەنگاوی

قوتابییەکی چینی کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خوێندوویەتی، بەراورد دەکات لە نێوان کەسایەتی ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاواییدا، دیارە مەبەست لە ڕۆژهەڵاتی وڵاتانی عەرەبیو ئاسیاو ئەفریقیا دەگرێتەوە، ڕۆژئاوایی وڵاتانی ئەوروپاو ئەمریکا دەگرێتەوە، لەم بەراوەردەدا ڕەنگی سووری بۆ ڕۆژهەڵاتی داناوە، وەرەنگی شینی بۆ ڕۆژئاوایی داناوە، بەراوردەکان زۆر بواری ژیانی تاكو کۆمەڵ دەگرێتەوە، کە ئەمانەش ئەو بەراوردانەن: تۆش دەتوانیت بەراووردی خۆت بکەیت...

* کەسی ڕۆژهەڵاتی بە پێچاوپێچ بەرەو ئامانجەکانیان دەڕۆن، بەڵام ڕۆژئاوایی ڕاستەوخۆ دەڕۆن.

* کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی کۆمەڵگەیەکی کۆمەڵایەتی یە، بەڵام ڕۆژئاواییەکان وەکو تاك دەژین.

* ڕۆژهەڵاتی یاخود کاتژمێری پێش دەوام ئامادە دەبێت وەکو خەڵکی یابان، یاخود کاتژمێرێك دوا دەکەوێت لەبەر خەوی گران وەکو کەنداویەکان، بەڵام ڕۆژئاواییەکان کاتی خۆیان دەزانن، ئەوە نەك هەر بۆ دەوامکردن، بەڵکو بۆ سەرجەم بوارەکانی تریش بەهەمان شێوەن...

* کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی پەیوەستن بەیەکەوەو یەکتری باش دەناسن، بەڵام کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی پەیوەندیەکانیان زۆر سنووردارەو چەند کەسێکی دیاری کراوی کەم دەناسن..

* دەگونجێت کەسی ڕۆژهەڵاتی بەدەمتەوە پێبکەنێت، بەڵام ناوەڕۆکی پێچەوانەیە، بەڵام کەسی ڕۆژئاوایی ئەوەی لەناخیدا هەیە بۆ بەرامبەرەکەی دەردەبڕێت..

* کەسی ڕۆژهەڵاتی بۆ هەموو شتێك حەز دەکات بە قەرەباڵغیو بێ سیستمی، بەڵام کەسی ڕۆژئاوایی حەز بە ڕیز بەستنو چاوەڕوانی دەکات..

* کەسی ڕۆژئاوایی لە ڕۆژانی پشوودا لەماڵی خۆیدا دادەنیشێتو پشوو بە مێشکی خۆی دەدات، بەڵام لە ڕۆژهەڵاتدا ڕۆژانی پشوو بەتایبەتی هەینی شەقامەکان زۆر قەرەباڵغ دەبێتو کەم کەس لەماڵدا دەمێنێتەوە!!.

* کەسی ڕۆژئاوایی لە ئاهەنگو نانخواردندا زۆر کۆمەڵ نابەستن، بەڵام ڕۆژهەڵاتی لەکاتی ئاهەنگو نانخواردندا لەیەك شوێندا کۆدەبنەوە.

* کەسی ڕۆژهەڵاتی حەز بەوە دەکات وێنەی هەموو شتێك بەکامێراکەی بگرێت، بەڵام ڕۆژئاوایی یەکان بەزۆری بە چاوەکانیان وێنەی شوێنەکان دەگرن تاوەکو لە بیریاندا بمێنێتەوە..

* کەسی ڕۆژهەڵاتی لە ڕووبەڕووبونەوەی گرفتەکاندا خۆی لادەدات، بەڵام ڕۆژئاوایی بەسەر گرفتەکاندا دەڕوات.

* کەسی ڕۆژئاوایی خواردنی سووك دەخوات، بەڵام ڕۆژهەڵاتی هەمیشە کەسێکی برسی یەو خواردنی گەرمو قورس دەخوات.

* کاتێك ڕۆژئاواییەکان بە ئۆتۆمبیل هاتوچۆیان دەکرد، ڕۆژهەڵاتییەکان بەسواری پاسکیل هاتوچۆیان دەکرد، ئێستا پێچەوانە بۆتەوە،

* تا دوێنی ئێمە لە پێشەوە بووین، ئێستا ئەوان، بەیانیش هەر خوادەزانێت؟؟!.

* کەسی ڕۆژهەڵاتی بە بارانو هەتاو دڵخۆش دەبن، بەڵام ڕۆژئاواییەکان تەنها بەهەتاو دڵخۆش دەبن، بۆچی؟ منیش نازانم!..

* منداڵ لە ڕۆژهەڵاتدا لەلایەن دایكو باوكو نەنكو باپیرەو خوشكو براوە دەورە دەدرێت، بەڵام منداڵی ڕۆژئاوا تەنها دایكو باوکە، ئەگەر فرێ نەدرێتە دایەنگاو سەرشەقامەکان.

* لە ڕۆژهەڵاتدا کەسی سەرۆكو سەرکردە ئەگەر شیاویش نەبێت، دەبێت شتێکی گەورەو دیارو جیاواز بێت، بەڵام لە ڕۆژئاوادا سەرۆك کەسێکە وەکو کەسەکانی ترو هەندێك تایبەتمەندی کەمی هەیە!.



# لەئێستادا بژی!!

ن: ئەندریۆ ماتیۆس
و: دانا فوئاد حەمەصاڵح

تەواوی سامانی ئێمە ئەم ساتەوەختەیە. چەند دەتوانێ لەم ساتەوەختەدا بژی، ڕادەی ئاسوودەیی مێشك و لێهاتوویی خۆی دیاری دەكات! بەبێ گوێدانە ئەو شتەی دوێنێ ڕوویداوەو ئەو شتەی كەڕەنگە سبەینێ ڕووبدات، ئێستا ئەو شوێنەیە كەئێوەی تێدان.

لەم ڕوانگەیەوە، نهێنی شادمانیو بەختیاری ئەوەیە كەتەنیا بیر لەساتەوەختی «ئێستا» بكرێتەوە.

یەكێك لە خاڵە سەرنج ڕاكێشەكانی منداڵان ئەوەیە كەئەوان بە تەواوی خۆیان لە ئێستادا نوقم دەكەن، ئەوان بەتەواوی سەرقاڵی چالاكی «ئێستا»یان دەبن، بۆ نموونە ئەم چالاكییە: دەكرێت سەیركردنی باڵندەیەك، وێنەكێشانێك، دروستكردنی كۆشكێك لە لم یان هەرشتێكی تربێت.

بەڵام كاتێك گەورە دەبین هونەری بیركردنەوەو نیگەرانبوون فێردەبین! بواری ئەوە دەدەین كەگیرو گرفتەكانی ڕابردووو كێشەكانی داهاتوو لە ئێستادا كۆبكەینەوەو بەم جۆرە «ئێستا» مان لەكیس دەچێ. هەروەها ئێمە فێردەبین كەچێژ وەرگرتنو شادمانییەكانی خۆمان دواخەینو بەردەوام بە هیوای داهاتوویەكی جیاوازدا دانیشین!

خوێندكارێكی دواناوەندی بەخۆی دەڵێ: «هەركات خوێندنم تەواوكرد، ئیتر ناچار نابم ئەركی قوتابخانە بەرێوەبەرم ئەوكات ژیان بەدڵی خۆم دەبێت».

خوێندن تەواو دەبێو ئێستا ئەو بۆی دەردەكەوێ تا ئەوكاتەی خانووی سەربەخۆی نەبێ بەختەوەر نابێت. ماڵەوە جێدەهێڵێت، دەچێتە زانكۆو بەخۆی دەڵێ: «كاتێك بڕوانامەكەم وەرگرت ئیتر خەمم نامێنێ».

سەرئەنجام بڕوانامەكەشی وەردەگرێو سەیردەكات تاكارێكی باشی نەبێت ناتوانێت بەختەوەربێت! بەتێپەڕبوونی ساڵ لەدوای ساڵ ئەو بەردەوام بەختەوەریو شادمانیو ئاسودەیی دەروونی خۆی، تا دەزگیران گرتن، زەماوەندكردن، تا كڕینی خانوو، تابەدەستهێنانی كارێكی باشتر، تاپێكەوەنانی ژیانی هاوبەش، تابردنی منداڵەكانی بۆ قوتابخانە، تا تەواوكردنی خوێندنی منداڵەكانی، تا خانەنشینیو... هتد، دوادەخات! بەم شێوەیە بەرلەوەی كەبواری شادمانییەكی بەختەوەرانە بەخۆی بدات كۆچی دوایی دەكات. تەواوی ساتە وەختەكانی «ئێستا»ی ئەو بەپلاندانان بۆ داهاتوویەكی جیاواز. كە هەرگیز وەدی نایەت تێپەڕدەبێت. ئایا بەسەرهاتی ژیانی ئێوەش وەك ئەم بەسەرهاتەیە؟ ئایا ئێوەش كەس ناناسن كەشادمانیو چێژ وەرگرتنی لەژیانی هەڵگرتبێ بۆ داهاتوویەكی نادیارو خەیاڵی؟ بۆ ئەوەی بەشادمانی بژین دەبێ بیر لە «ئێستا «بكەینەوەو خۆمان بەئێستاوە سەرقاڵ بكەین. بەڵام لەجیاتی ئەوەی چێژ لە ساتەكانی ژیانی «ئێستا»مان وەربگرین، خۆمان بەپلان دارشتن بۆ شادمانییەكانی ساڵی داهاتووەوە خەریك دەكەین.

بەختیار حسین



## سەرەمەشق لە ئامۆژگاری ڕووت باشترە

كیسەڵێكی دایكانە بە بێچووەكەی خۆی گوت: (كوڕم، لەسەر تەنیشت مەڕۆو خۆشت لەبەردی تەڕ مەخرێنە).

بێچووەكەی وەڵامی دایەوە: (باشە، دایە گیان، مادام دەتەوێ من وابم دەی خۆت ڕاست بڕۆ، چونكە من تەماشای تۆ دەكەمو لاسایی تۆ دەكەمەوە).

ڕەخنە گر دەبێ خۆی ڕاست بڕواتو ڕاست بژی ئینجا ئامۆژگاری خەڵك بكات.



# 12 گریمانە بەناوبانگەکەی N.L.P

عادل شاسواری خوێندکاری ماستەر/ زانکۆی سلێمانی

ئەم زانستە هەوڵ دەدات لەلای تاك چەند گریمانەیەك بچەسپێنێ، بۆ دروستکردنی پردێکی پەیوەندی پتەو بۆ ناسینی خودی خۆی و کردنەوەی کۆدی ئەوی تر واتە: چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ دەوروبەر و ژیاندا. تالەرێگەی ئەوەوە بیگەیەنێت بە ژیانێك کەبەبێ بوونی ئەو پردە ئاسان نییە بتوانرێ دەرك بەنهێنیەکانی ناو ئەو جیهانە پڕ لەگەنجینە مەزنە بکرێ کە پێی دەوترێ (ئەندازەی دەروونی) یان (پرۆگرامسازی زمانەوانی دەماریی) یان (بەرنامەی گەشەپێدانی مرۆیی) یاخود هەر دەربڕینێکی گونجاوتر کە لەداهاتوودا دروست بکرێ بۆ زاراوەی (N.L.P)، کەلەبنچینەدا ئەم زانستە دەیەوێت وا لە مرۆڤ بکات بتوانێ سەرلەنوێ خۆی دابڕێژێتەوە لەسەر بنەمای ناسینی خۆی، ناسینی کۆدەکانی، زانینی پاسۆردی کۆدەکانی، ئەمەش یەکەم هەنگاوی ئەو ڕێگا بەرینەیە و تەنها ئەژمارکردنی (١٢)گریمانە بەناوبانگەکە مرۆڤ ناگەیەنێتە تێگەیشتنی تەواویان، بەڵام دەکرێت شرۆڤەی هەرکام لەم خاڵانە ببێتە هەوێنی بابەتێکی سەربەخۆ لە پاشەڕۆژدا، ئەو گریمانانەی کە خاوەنی ڕاستەقینەیان خودی (N.L.P)خۆیەتی و لە چەندین کتێب و سەرچاوە و سایت و (CD) یدا دەستدەکەون بەزمانە جیاوازەکان، بەتایبەت لەلای گەورە پاسکاری وەك: (د.ریتشارد باندلەرود. جۆن گریندەر و ستیفانی لیرنەرود. ئەنتۆنی رۆبنز و د.ئیبراهیم فەقێ و کریم شازلی و د.محەمەد تکریتی و...هتد). کە هەندێ ئاڵوگۆڕی وشەو جیاوازی دەربڕینی لێ جیابکەیتەوە لەلای هەمووان هەمان ئەم مانایانە ئەدەن بەدەستەوە کە ئێستا دەیخەینە بەردەم بەڕێزتان، فەرموون ئێوەو گریمانەکان:

١- ڕێزگرتن و قبوڵکردنی ئەوانی تر (واتە: خەڵك) وەکو خۆیان کەهەن.. (نەك وەك ئەوەی تۆ دەتەوێت ببن).

٢- نەخشە خودی ناوچە نییە.

٣- هەموو مرۆڤێك ڕابردوویەکی هەیە کە کۆی ئەو توانایەی تێدایە کە پێویستییەتی بۆگۆڕانکاری و چاکسازی لە ژیانیدا.

٤- خەڵکی هەموو هێزو توانایان دەخەنەکار بۆ هەڵبژاردنی باشترینی ئەو هەڵبژاردانەی کەلەوکاتە دیاریکراوەدا لەبەردەستدایە.

٥- لە پشت هەموو ڕەفتارێکەوە نیازێکی باش هەیە.

٦- بۆ هەموو مرۆڤێك دوو ئاستی پەیوەندی هەیە: هۆشیاری(ئاگایی) ..ناهۆشیاری(نائاگایی).

٧- شکستهێنان بوونی نییە، بەڵکو ئەوەی هەیە شارەزایی و ئاکامی ئەزموون و تاقیکردنەوەیە.

٨- کەسی نەرموونیان و لەسەرخۆ زیاتر دەتوانێت کاروبار بەڕێوەبەرێت.

٩- مانای پەیوەندیکردن ئەو دەرەنجامەیە کە پێی دەگەیت.

١٠- عەقڵ و جەستە کاریگەریان لەسەر یەکتری هەیە.

١١- Modeling/ ئەگەر شتێك بگونجێت بۆ هەرکەسێك، ئەوا دەگونجێت کەسێکی تریش فێری ببێت، چۆن کارەکانی خودی خۆی ئەنجام دەدات. کەئەم خاڵە بە نمذجة یان تمثیل یان مۆدێلینگ بەناوبانگە.

١٢- من بزوێنەری ژێری خۆمم کەواتە بەرپرسیاری ئاکامی کردارەکانمم.

# مەرج نییە!

زانا کریم



**مەرج نییە** هەرکەسێ کە پێکەنی دڵی خۆشبێت! هەروەکو چۆن مەرجیش نییە هەرکەسێ گریا دڵی ناخۆش بێت!

**مەرج نییە** هەموو هۆکارێك بۆ ڕێگای دروست بێت! هەروەکو چۆن مەرجیش نییە هەموو هۆکارێك بۆ ڕێگای خراپ بێت!

**مەرج نییە** هەموو دەوڵەمەندێك بەختەوەر بێت! هەروەکو چۆن مەرجیش نییە هەموو هەژارێك بەد بەخت بێت!

**مەرج نییە** هەموو شتێکی جوان چاك بێت! هەروەکو چۆن مەرجیش نییە هەموو شتێکی ناشیرین خراپ بێت!

**مەرج نییە** هەموو بچووکێك عەقڵی بچووك بێت! هەروەکو چۆن مەرج نییە هەموو گەورەیەك عەقڵی گەورە بێت!

**مەرج نییە** هەموو ڕۆشنبیرێك خوێندەوار بێت! هەروەکو چۆن مەرجیش نییە هەموو خوێندەوارێك ڕۆشنبیر بێت!

**مەرج نییە** هەموو خۆشەویستان بگەن بە یەکتر! هەروەکو چۆن مەرجیش نییە هەموو دوژمنان لە یەکتر دابڕێن!

**مەرج نییە** هەموو ڕۆح لە بەرێك زیندوو بێت! هەروەکو چۆن مەرجیش نییە هەموو ڕۆحێك مردوو بێت!

**مەرج نییە** ژیان بۆ هەموو کەس مایەی خۆشی بێت! هەروەکو چۆن مەرجیش نییە بۆ هەموو کەسیش مایەی ئازار بێت!

★ مەرج نییە هەرکەس چاوی داخرا بوو نووستبێت! هەروەکو چۆن مەرجیش نییە ئەگەر چاوی دانەخرابوو هۆشیار بێت!

# پرنسیپەکانی سەرکەوتن!!



بەشی دووەم

ئا/ سەرکۆ یونس

* کارەکانت بەپێی لە پێشینەیان ریز بەند بکە: بەلای کەمەوە رۆژی یەکێك لەئامانجەکانت دیاری بکە بۆئەوەی لەرێیەوە بەرووی تەنگو چەڵەمەکاندا بووەستێت.

لەکۆتایی هەموو رۆژێکدا ماڤی خۆتە پشوویەك بدەیتو چێژ لەو هەستە خۆشە وەرگریت کە هەستی بەدیهێنانە.

*** پەیامێک بۆخۆت دابنێ کە ئامانجت لەژیاندا دیاری بکات:**

بەڵگە نامەیەك بۆخۆت دابنێ تیایدا ئامانجت لەژیاندا دیاری بکە تۆ کێیت؟ ئەو بەهایانە چین کە پابەندی پێیانەوە؟ مرۆڤ یەکجار دەژی، چۆن کاتت بەسەر دەبەیت بۆئەوەی وابکەیت ژیانت مانایەکی هەبێت؟ تۆ- لەدوای بریاری خودایی — خۆت پاشە رۆژی خۆت دیاری دەکەیت، لەبەرئەوە گوێ بەوکەسە مەدە کەپێت دەڵێت: تەمەنت بە بەریەوە نەماوە، یان هێشتاکە زۆر منالیت، یاتۆ زۆر هەژاریت، یا رووخسارت نایکات، یارەنگت جیاوازە، یا تۆخمەکەت نەگونجاوە، یارەگەزنامەکەت جیاوازە. ئەم جۆرە وتنە کارناکەنە سەر کەسێك کە پرنسیپەکانی سەرکەوتن جێ بەجێبکات.

کاتێك چەند برگەیەکی کتێبێك یان گۆڤارێك یان رۆژنامەیەك دەخوێنیتەوە کەبیرۆکەی ئیلهام بەخشی تێدایە، ئەو برگە هەڵبژێراوانە بنووسەرەوە یا بیانبرەوەو بیانخەرە فایلێك یا ناو سندوقێکەوە بیانکە بەبەشێك لەو سەرچاوانەی یارمەتیت دەدەن لەدارشتنی ئامانجی تایبەتیدا یا دارشتنی پەیامەکەت لەژیاندا.

پەیامی تۆ لەژیاندا دەشێت لەچەند رستەو برگەیەکی کەم پێك بێت. پێویستە بەردەوام بەو پەیامەدا بچیتەوەو لەوە دوو دڵ نەبیت کەبیگۆریت. پەیامی تایبەتیت ئەو بناغەیەیە کەدەتوانیت خەونو مەبەستەکانی لەسەر بنیات بنێیتو هەروەها یارمەتیت دەدات لەدیاریکردنی ئامانجەکانتاو لەئامادەکردنی تۆماری بیرخەرەوەی رۆژانەتداو لەروون کردنەوەی ئەو شتانەی کەرۆژانە جێبەجێیان دەکەیت.

*** بەردەوام بە لەئەنجامدان:**

کارەکە تەواو بکە تا وەکو لەوە دڵنیابیت کەوەك پێویست ئەنجامت داوە. سوپاسی ئەو کەسە بکە کە شایستەی سوپاسەو داوای بیرۆکەی نوێی لێ بکە، داوای جێبەجێکردنی کاری زۆرتر بکە. کاتێك بۆت دەرخستن کەتۆ ئامادەی بۆ کارکردنو کارەکەش وەك پێویست ئەنجام دەدەیت رێزت لەبەرچاوی خەڵکیدا پتر دەبێت. کۆڵنەدان مانای ئەوەیە تۆ کەسێکی رێز لە وشەی خۆت دەگریت بایەخ بەکارەکەت دەدەیت، مانای وایە تۆ ئامادەی بۆئەوەی مامەڵەی خەڵکی بکەیتو هێڵەکانی پەیوەندی لەنێوان تۆو ئەواندا کراوەبێت. لەوانەیە بکەویتە هەندێك هەڵەوە، کاتێك کارەکەت دەگەیەنیتە کۆتایی لەوانەیە هەلی راستکردنەوەی ئەو هەڵانەت بۆبرەخسێت یان وانەیەکیان لێوە فێرببیت. سووربە لەسەر بەدوادا چوونی تایبەتی خۆتدا لەرێی نووسینی نامەی دەستنووس یان گفتوگۆی تەلەفۆنییەوە. بەخۆتا بچۆرەوەو خەڵاتەکان کۆبکەرەوە. تەواو کردنی کار گەورەترین نیشانەیە بۆ بە توانابیت.

* خۆت بدە دەست هێزی خودایی:

تەماشای تێکرای دیمەنە کە بکە: تۆ ژیانت لە سەر بناغەی بڕواو پابەند بوونت بە بیرو راکانتەوە بنیات دەنێیت، لەوە مەترسە بیرو راکانت بە خەڵکی رادەگەیەنێت تۆ پابەندی بە بەها باشەکانەوەو لە مامەڵەی کە سانی تردا پابەندیت بە پرنسینپە ئاکاریەکانەوە - تۆ نزاو پارانەوە بۆ ئەوە دەکەیت کە تەواو زاڵبیت بەسەر ترسەکانتا ئەو کێشەو تەنگوچەڵەمانە لەناو ببەیت کە رۆژانە دێنەرێی گەیشتنت بە سەرکەوتن - تۆ بەو خێزانە بە ختەوەردەبیت کە لەم دنیایەدا - بێ فێز بەو خۆت بدە دەست خودا، تۆ مرۆڤیتو لە هەڵە بەدەر نیت (هەموو ئاینەکان هانی نزاو پارانەوە دەدەن) تۆ لە کاتی نزادا لەگەڵ یەزداندا دەدوێیت (داوای سەرکەوتنو بەختەوەری لە یەزدان بکەو ئەویش بەدەم داواکەتەوە دێت) یا نزاکەت کارکردنی بە دوادا بێت، خۆپەرست مەبەو دەستی یارمەتی بۆ کەسانی تر درێژ بکە.

*** شتەکان ئاڵۆز مەکە:**

ژیانی خۆت ئاڵۆز مەکە (بەر لەوەی کار ئەنجام بدەیت بیر بکەرەوە) سەرەتا بۆ ئەو وەلامو رێگە سادانە بگەرێ کە ئەگەری هەڵکردن تیایاندا کەمە لەو بنەمایانەوە دەست پێ بکە کە لای خۆت هەن، لەوە دڵنیابە کە تۆ کار بە مەسەلەیەك دەکەیت بەر لەوەی دەست بەچارەسەر بکەیت کاتی پێویست بۆ کارەکە چەندە؟ چ شێوازێکی کار ئەنجامدانت لێ چاوەروان دەکرێت بۆئەوەی کارەکەت پەسەند بێت؟ جارێکی دی بە شێوازی کارکردنەکانتا بچۆرەوە، ئایا تەنیا کارێك هەیە کە گشت کاتەکەت بگرێ؟ ئایا ئەو کارە شایستەیە کە ئەو کارەی بۆ تەرخان بکرێت؟ ئایا سەرچاوەی پێویستت هەیە بۆ ئەنجامدانی، ئایا دەبێت کەسێکی دی رابسپێریت بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە؟ گەر ئەو راسپاردانە شیاو بێت، ئایا کەسی گونجاوت دەست دەکەوێت بۆ ئەو کارە؟ لەم کاتەدا دەتوانیت سوود وەربگریت لە لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوەی هێمنو پابەند بونت.



# ئەتیکێتی
# شوێنە گشتییەکان/ ١

شوێنە گشتییەکان بۆ کەس نییە بە ئارەزووی خۆی کۆنترۆڵی بکاتو چۆنی ئارەزووە ئاوها هەڵسوکەوتی تێدا بکات، ڕەچاوکردنی زەوقی جوانو ئەتیکێت ئاماژەی شارستانیەتو ڕۆشنبیریو تێگەیشتوویی کۆمەڵگایەو وا دەکات کە لەو شوێنانەدا هەست بە ئارامیو خۆشحاڵی بکەیت، با پێکەوە گرنگترین ئەو خاڵانە باس بکەین کە ڕەچاوکردنیان دەبێتە مایەی دڵخۆشیو شانازی هەموو لایەك.

**هۆکارەکانی هاتوچۆ:**

١- چەند خۆشە هۆکارەکانی هاتوچۆ وەکو هەندێك ئۆتۆمبیلی نموونەیی پاكوخاوێنو بۆنخۆشو گونجاوبنو کاتێك بەکاریان دەهێنیت ترسی دڕانی جلوبەرگو پیسبوونیانت نەبێت!!

٢- چەند خۆشە هاوکاری یەکتر بکەین لە کاتی سوار بوونی پاصداو بە شێوەیەکی جوان هەر یەکێك لە ئێمە سنوری کورسیەکەی خۆی بزانێتو هاوڕێکەی ئازار نەداتو چاودێری ئەوکەسانە بکەین کە نەخۆشو بەتەمەنن.

٣- سواربوونی پاص بەجلوبەرگی کارەوە دیمەنێکی نا شارستانیەو دەبێتە مایەی پیسبوونی ئۆتۆمبیلەکەو جلوبەرگی نەفەرەکان، دەبوا ئەو جۆرە کەسانە یا بە ئۆتۆمبێلی تایبەت هاتوچۆ بکەن یا لەکاتی هاتوچۆدا جلەکانیان بگۆڕنو بە جلی چەورو پیسەوە نەیەنە هۆکارەکانی هاتوچۆوە.

٤- خۆزگە وەکو جاران پاسەکان تەنها لە وێستگەکاندا دەوەستانو بێ هۆ یا بێ گەران بە شوێن نەفەردا هیچ هەڵوێستەیەکیان نەدەکرد.

٥- جگەرە یا گوڵە بەڕۆژە لە نێو پاصدا زۆر دوورە لە شارستانیەتو ڕۆشنبیرییەوەو ستەم کردنە لە مافی بەرامبەر، یاخود چ کارەساتێکە لە قەمەرەیەکی مۆدێل کۆندا کە لەبری چوار کەس شەش کەسی تێدایەو سێ کەسیان جگەرە بکێشن لە نێوان ڕێگای هەولێر سلێمانیدا، تۆش کە مافی خۆتە نەیەڵی جگەرە بکێشن بەڵام دەبێت بە دوعاو پاڕانەوە هەوڵی ئاگر بەستیان لەگەڵدا بدەیت.

٦- بەرزکردنەوەی دەنگی ڕادیۆ یا (CD) لە ناو هۆکارەکانی هاتوچۆدا دیاردەیەکی ناشیرینەو نەفەرەکان وەڕەز دەکات.

٧- پێشبرکێو تووڕەبوونو هاویشتنی پلارو توانجو قسەی ناشیرین لە نێوان شۆفێرەکاندا دیاردەیەکی ناشیرینەو پێویستە وازی لێ بهێنرێت.

**چەند خاڵێکی تایبەت بە ئۆتۆمبێل:**

لەبەرئەوەی کە ئۆتۆمبێل پەیوەندی بە زۆر بوارەوە هەیە کە بەرژەوەندی گشتی دەگرێتەوە زۆر گرنگە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەین:

١- ئۆتۆمبێل نیعمەتەو با نەیکەین بە مایەیماڵوێرانی.

٢- ئۆتۆمبێل لێ خوڕین، زەوقو ئاکارو سەلیقەی جوانە پێش هەموو شتێکی دی.

٣- کاتی گەڕانەوە بۆ ماڵ چەند جوانە بە هێمنی بێینەوە ناو کۆڵانو بە دەنگی هۆڕین جیهانێك هەراسان نەکەین.

٤- کاتێك دەگەینە بەردەرگای ماڵ با بە هۆڕین داوای کردنەوەی دەرگا نەکەین، چی دەبێت ئەگەر خۆمان دابەزین بە کلیل دەرگاکەمان بکەینەوە، یا خود لە ڕێگای زەنگەوە ئاگاداریان بکەین.

٥- کاتەکانی نیوەڕۆو شەوانە درەنگ کاتی پشوودانو خەوتنە با هەوڵ بدەین هاتوچۆ لەو ماوەیەدا کەم بکەینەوەو زۆر بەهێمنی بجوڵێینەوە.

٦- کۆڵان جێگای فیتەریی نییەو نابێت بەو کارە دراوسێو کۆڵان هەراسان بکەین.

٧- شوێنی تایبەت هەیە بۆ شۆرینی ئۆتۆمبیلو بۆ کەسێك کە خاوەنی ئۆتۆمبیلە، زۆر گران نییە ئەگەر هەفتەی دووجار لەو شوێنە دیاری کراوانە کە بە (Car Service) ناو دەبرێن ئۆتۆمبێلەکەی بشواتو کۆڵان نەکات بە قوڕو چلپاو.

٨- ڕاگرتنی ئۆتۆمبێل لەبەر دەرگای کەسانی تر، بێ پرسو ئاگایی خۆیان، کارێکی جوان نییەو بەکارهێنانی مافی خەڵکی یە بێ ڕازیبوونی خۆیان.

٩- ڕاگرتنی ئۆتۆمبێل بەگشتیو ئۆتۆمبێلی گەورە بە تایبەتی لە کۆڵاندا وەکو پاصو لۆریو گەڵابەو شۆفڵ کارێکی ناشارستانییەو کارەساتی زۆر دڵتەزێنیشی لێ کەوتۆتەوە.

١٠- خۆزگە شۆفێرانی وڵاتی مەش، وەك شۆفێرانی هەموو دونیا، کاتێك کەسێك دەیەوێت بپەڕێتەوە لەشەقامەکاندا، لە بری خاوکردنەوە پێیان بە بەنزیندا نەدەنا.

# پشت بە خۆتان ببەستن

پشت بە خۆبەستن و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی، گەورەترین ڕێگای سەرکەوتن و سەلماندنی بوونی خۆیە لەسەر نەخشەی ژیان.

بێ پشت بەستن بەخۆ ناتوانین بەرەنگاری ژیان و گرفتەکانی ببینەوەو پەیوەندییەکی باش لەگەڵ خۆمان و دەوروبەردا دروست بکەین.

هاوکات ناتوانین متمانە بە خودی خۆمان بکەین و هەمیشە کارو ناتەواوییەکانمان دەخەینە ئەستۆی کەسانی تر، لەبری ئەوەی خۆمان بە بەرپرسیار بزانین کەسانی تر دەکەینە بەرپرسیارو بۆ هەموو هەڵەیەکی خۆمان ئەوان تاوانبار دەکەین.

خۆشەویستانم: نابێت ئێمە دەوروبەر تاوانبار بکەین، کاتێک هەموو بەیانییەک لەخەو هەڵدەستین و هیچ بەرنامەیەکمان نییە!

هیچ ئامانجێکمان بۆ خۆمان لە ژیاندا دیاری نەکردووە، تا کاری بۆ بکەین!

بە هیچ شێوەیەک هەوڵی داهێنان و گۆڕان نادەین! چۆن ئێمە دەوروبەرمان تاوانبار بکەین، لە کاتێکدا تا ئێستا خودی خۆمان بە تەواوەتی نەدۆزیوەتەوەو بە خودی خۆمان ئاشنا نین؟

نکوڵی لە دواکەوتنی دەوروبەر ناکرێت لە بینینی ڕۆڵی پێویست لە پەروەردەو ئاراستەکردن و ڕێنمایی نەوەکاندا، بەڵام ئەمە نابێت ببێتە هۆکارێک بۆ پشت هەڵکردن لە هەموو لێپرسراوێتییەکانی ژیان، چونکە لەم حاڵەدا تەنها خۆمان زەرەرمەند دەبین!

ئەگەر دەوروبەر یارمەتی نەداوین بۆ ئەوەی خاوەنی بەرنامەی ڕێك وپێك و پرۆژەی دوارۆژ بین بۆ خۆمان و کۆمەڵگاکەمان.

ئەگەر یارمەتی نەداوین بۆ ئەوەی کەسێکی سەرکەوتوو و بەرهەم هێن بین و کەسایەتیەکی سەرکردەو بەڕێوەبەرێکی هونەرمەندی ژیان بین.

دەبێت خۆمان بە هەموو ئەو کارانە هەڵسین، ئەگەر خۆمان و ئێستاو سبەینێمان بەلاوە گرنگە.

کەواتە کاتی ئەوە هاتووە کە چی دی چاوەڕوانی کەسانی تر نەبین بۆ ئەوەی کێشەکانمان بۆ چارەسەر بکەن، پێشینانیش ڕاستیان گوتووە کە دەڵێن: (ئەوەی بە تەمای کاسەی دراوسێ بێت بێ شێو سەر دەنێتەوە).

کەواتە با چی دی کەسانی تر تاوانبار نەکەین، کاتێک خۆمان بێ بەرنامەین.

چی دی چاوەڕێ نەبین کەسانی تر بەرنامە ڕێژیمان بۆ بکەن!

کاتێک خۆمان ناخوێنینەوە نەڵێین خەتای مامۆستاکانمانە!

کاتێک خۆمان ناخوێنینەوە نەڵێین خەتای قوتابخانەیە!

کاتێک کاتەکانی ژیانمان بە هەدەر دەدەین نەڵێین دەوڵەت هەلی بۆ نەڕەخساندووین.

بەڵکو با هەموومان بڕیاری گۆڕان و ڕاپەڕین بدەین لە ناخی خۆمانداو لەگەڵ خودی خۆماندا ئاشت ببینەوەو وەکو هاوڕێیەکی باشی خۆمان، بەرەو ژیانێکی نوێی پڕ لە ئاوات و خۆزگەو هیوای جوان هەنگاو بنێین.

با خۆمان فێری هونەرەکانی ژیان بکەین.

با کاتەکانی ژیانمان بکەینە کێڵگەی هیواو ئاواتەکانمان. با هەموو ڕۆژێکمان ڕازاوە بێت بە بەرنامەو پرۆژەی نوێ.

با هەمیشە ئەمڕۆمان لە دوێنێ باشترو سبەینێمان لە ئەمڕۆ باشتر بێت.

با ئەو کەسە بین کە خۆمان دەمانەوێت و خاوەنی کەسایەتی سەربەخۆی خۆمان بین. با ڕۆژانە سەرگەرمی خوێندنەوەو گەشە بەخۆدان بین و پەیوەندییە مرۆییەکانمان پەرە پێبدەین.

با زیرەکانە هاوڕێکانمان هەڵبژێرین، بۆ ئەوەی باشترین یارمەتیدەرمان بن لە هەموو قۆناغەکانی ژیانماندا.

با ئامادە باشیمان بۆ هەموو قۆناغێکی نوێی ژیان تێدا بێت و پێش ڕووداوەکان خۆمان بۆ ئامادە کردبێت.

ئازیزانم: مرۆڤ زۆر گەورەو بە توانایەو پەروەردگار هەموو تواناکانی پێ بەخشیوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی سەر زەوی، دەبا سوود لە بەهرەو تواناکانمان وەرگرین و کەشکۆڵی بڕوا بە خۆبوون بکەینە شان و بەرەو ژیانێکی نوێ و ئایندەیەکی ڕووناك هەنگاو بنێین.



# کچان و کوڕان لە نێوان ئازارو ئاواتدا



شێخانی

# ئای ئەگەر ئیمەیڵێکت دەبوو!!

کابرایەك داوایەکی پێشکەش بە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت کرد بۆ دامەزراندنی بە فەراش لە کۆمپانیاکەدا.

دوای چاوپێکەوتن و هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەی بە پاککردنەوەی زەوی ئۆفیسی کۆمپانیا، بەڕێوەبەری کۆمپانیا ڕەزامەندی خۆی لەسەر دامەزراندنی دەربڕی و پێی ڕاگەیاند کە خشتەی کارو بەرواری دەست بەکاربوونی لە ڕێگای ئیمەیڵەوە بۆ دەنێرێت.

کابراش لە وەڵامدا گوتی: بەڵام قوربان من نە کۆمپیوتەرم هەیە نە ئیمەیڵ!!

بەڕێوەبەر بەسەر سورمانەوە پێی گوت: ئەوەی ئیمەیڵی نەبێت، ئەوا ئەسڵەن بوونی نییە، ئەوەش کە بوونی نەبێت مافی کارکردنی نییە!

کابرا بە دڵشکاوی و بێ هیواییەوە هاتە دەرەوە! زۆر بیری کردەوە کە دەتوانێت چی بکات؟ لە کاتێکدا کە جگە لە (١٠) دۆلار هیچی تر شك نابات! دوای بیرکردنەوەیەکی قوڵ ڕووی کردە بازاری سەوزە فرۆشان و سندوقێك تەماتەی کڕی و دەستی کرد بە تەماتە فرۆشتن لە گەڕەکەکاندا.

لە هەمان ڕۆژدا ئەم کارەی سێ جار دووبارە کردەوەو توانی سەرمایەکەی چەند قات زیاد بکات و ئێوارە کە گەڕایەوە ماڵەوە لەبری (١٠) دۆلار (٦٠) دۆلاری لە باخەڵدا بوو!!

کابرا درکی بەوەکرد کە دەتوانێت بەم شێوەیە بژی، لەبەرئەوە بڕیاری دا ڕۆژانە ئەم کارە ئەنجام بدات، بۆ ئەم مەبەستەش بەیانیان زوو لە ماڵ دەچووە دەرەوەو شەوان دەگەڕایەوە.

قازانجی ئەم کابرایە هەر ڕووی لە زیاد بوون دەکرد، دواتر هەڵسا بە کڕینی عارەبانەیەك و دواتر ئۆتۆمبیلێکی بار هەڵگرو پاشان بوو بە خاوەنی کۆمەڵێك (شاحنە) بۆ گەیاندنی داواکاری هەمیشە کڕیارەکانی، پاش پێنج ساڵ ئەم کابرایە بوو بە گەورەترین هاوردەکارانی خۆراك لە ئەمریکادا!!

ئەم کابرایە بۆ مسۆگەرکردنی دوا ڕۆژی خێزانەکەی ویستی بۆلیسەیەکی تەئمین بکرێت و بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندی کرد بە گەورەترین کۆمپانیاکانی تەئمینەوە.

دوای ئەوەی یەکێك لەو کۆمپانیایانەی هەڵبژارد، کارمەندی ئەو کۆمپانیایە کاتێك فۆرمەکەی بۆ پڕ کردەوە داوای لێکرد کە ئیمەیڵەکەی بداتێ! کابراش لە وەڵامدا پێی گوت: ببورە ئیمەیڵم نییە!!

کارمەندەکەش بەسەر سورمانەوە پێی گوت: تا ئێستا ئیمەیڵت نییەو خاوەنی ئەم هەموو سەروەت و سامانەیت و ئەم ئیمپراتۆرە گەورەیەت بنیاتناوە!؟

جا ئاخۆ ئەگەر ئیمەیڵت هەبووایە، ئەمڕۆ دەبوا لە کوێ بوویتایە؟!

کابراش دوای بیرکردنەوەیەکی کورت پێی گوت: ئەگەر ئیمەیڵم هەبووایە ئێستا فەراش دەبووم لە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت!!

کەواتە چارەنووسی تۆ بە یەك کارەوە پەیوەست نییە!! مەرج نییە ئەگەر لە دەرگایەکتداو بۆت نەکرایەوە، ئیتر دەستەو ئەژنۆ دابنیشی و هیچ هەوڵێك نەدەیت!!

مەرجیش نییە کارێك کە زۆر ئارەزووی دەکەیت و بۆت فەراهەم نەبوو، تاکە ترووسکەی سەرکەوتنی تۆیە، بەڵکو هەندێك جار کە قەدەر لە دواساتەکاندا رووت لە کارێك وەردەچەرخێنێ نیگەران مەبە، لەوانەیە خێری تۆی تێدا بێت و تۆ نازانیت!!

ئەگەر سەدان جار هەوڵەکانت شکستیان هێنا بێ هیوا مەبە، ئەوەی لەسەر تۆیە کۆڵنەدانەو سەرکەوتنیش موڵکی کۆڵنەدەرانە.

# مرۆڤ و هیوا!

ئا/ نەوزاد أحمد كريم

دیل کارینگی دەڵێت: (بێچارەترین خەڵکی سەرزەوی ئەوانەن کە هیوایەك لە هزردا پەروەردە ناکەن، چونکە ئامانجەکان لە هیواکانەوە رەگ دادەکوتن) مرۆڤ هەر لەتەمەنی منداڵییەوە هیوا گەلێکی زۆر لەناخیدا دروستدەبێت، بەڵام زۆربەی هیواکانی تەمەنی منداڵی وردەوردە تا ئەو کاتەی خۆی دەناسێت لە کۆمەڵگادا لەناو دەچێت. بەڵام هیوا سەرەکییەکانی مرۆڤ لەتەمەنی لاوێتیەوە لەناخیدا دروست دەبێت. بەڵام ئەوەی جێگەی گرنگیپێدانە لەلایەن مرۆڤەوە زانینی هیوا کانیەتی کە تا چەند گرنگن یاخود کایگەری ئەرێیی بۆ هەیە، چونکە ناسینی خۆتو زانینی ئێستاو داهاتووت لە هیواکانتدا دەبینیت، هیواکانمان هەمیشە ئاوێنەی ناخو ئێستاو داهاتوومانن. هەموو ئەو شتانەی کە دەبنە هۆی نیگەرانی هەر مرۆڤێك ئەو واقیعانەن کە پێچەوانەی هیواکانی دروست دەبن، یاخود ئەو بەربەستانەن کە رێگرن لە گەیشتن بە هیواکانی، بەڵام (ریچارد دلفلایس) دەڵێت: (نە دیواری بەردین زیندان دروست دەکات، نەشیشی ئاسن قەفەز دروست دەکات). هەروەها (چارلی چاپلین) دەڵێت: (چەکی هیوا فڕێ مەدەن).

سەرچاوەی دروستبوونی هیواکانمان هەموو ئەو رووداوانەن کە روودەدەن، یان کۆمەڵگە یان هەموو ئەو شتانەن کە لەم جیهانەدا هەستیان پێ دەکەین، چونکە هەموو ئەو شتانەی باسمان کرد هەریەکەیان بەجۆرێك کاریگەری هەیە بۆ سەر ناخی هەر مرۆڤێك لێکدانەوەی مرۆڤێك بۆ مرۆڤێکی تر جیاوازە، لێکدانەوەکانی ناخمان هیوامان لا دروستدەکات، یان هەندێك جار کاریگەری ئەمانە بە شێوەیەك دەبێت هەندێك لە هیواکانی ژیانمان نامێنێت. بەڵام وتەیەك هەیە: (بوونی هیوا لە مرۆڤدا وەك باڵ وایە بۆ باڵندە)، واتە مرۆڤ هەمیشە دەبێت بە هیواوە بژی ئەگەر نا هیچ شتێکی پێ ناکرێت.

(ئوفید) دەڵێت: (هیواکانم هەموو دەمێك نایەنە دی، بەڵام من هەمیشە هیوام هەیە). هەروەها (شیشرۆن) دەڵێت:تا ژیان هەبێت هیواش هەیە).

# بۆ ئەوانەی نەکەوتوونەتە داوی خۆشەویستییەوە!!

و:محمد موسى

جارێك قوتابییەكو مامۆستاكەی لە ژێر دارێكی گەورە لە ناو سەوزەگیایەكی جواندا دانیشتبوون، لەناكاو قوتابیەكە لە مامۆستاكەی پرسی: (مامۆستا سەرم لێشێواوە، چۆن دەتوانین هاورێی ژیان بۆ خۆمان بدۆزینەوە تكا ئەكەم دەتوانیت یارمەتیم بدەیت؟).

مامۆستا دوای ساتێك بێدەنگی، پێی دەڵێت: وایە، بەراستی پرسیارێكی زۆر دژوارو ئاڵۆزە!

قوتابی: (زۆر بە قوڵی بیردەكاتەوە)چۆن؟

مامۆستا: سەیری ئەو لایە بكە گژوگیایەكی زۆری لێیە، بۆچی بۆ ئەوێ ناچیت، بەڵام تكایە هەرگیز بەرەو دواوە مەگەرێوە، تەنها بەرەو پێشەوە برۆ.

لەسەر رێگای خۆت، هەوڵبدە گیایەكی جوان بدۆزیتەوەو هەڵیبگریتەوەو دواتر بیدە بە من. بەڵام تەنها یەك دانە بێت.

قوتابی: بەڵێ باشە، كەواتە چاوەرێم بكە، بەرەو كێڵگەی گژوگیاكە رۆیشت، دوای چەند خولەكێكی كەم.

قوتابی: هاتمەوە.

مامۆستا: ئێ، باشە هیچ گیایەكی جوانت بەدەستەوە نابینم؟

قوتابی: لەگەشتەكەمدا هەندێ گیای جوانم بینی، بەڵام وامزانی كەیەكێكی جوانتر دەبینمەوە، بۆیە هەڵم نەگرتنەوە، نەشمزانی گەیشتوومەتە كۆتایی كێڵگەكەو هیچیانم لێ نەكردۆتەوە، چونكە پێت وتم بۆ دواوە نەگەرێمەوە، جامنیش بۆ دواوە نەگەرامەوە.

مامۆستا: ئەوەیە كە لە ژیانی راستیدا روودەدات!

پەیامی ئەم چیرۆكە چییە؟

گژوگیا: خەڵكی دەوروبەری تۆن.

گژوگیای جوان: ئەو خەڵكەیە كە سەرنجی تۆ رادەكێشن.

كێڵگە: كاتە.

لە گەران بەدوای هاورێی ژیانت، تكایە هەمیشە بەراوردمەكەو بەهیوای ئەوەبیت كە یەكێكی باشتر هەبێت، بەو كارەت تەمەنی ژیانی خۆت بەفیرۆ دەدەیت.»

لەبەرئەوە لەیادت بێ:» كاتو تەمەن هەرگیز ناگەرێنەوە.»

ئەمە هەمان هاوكێشەیە بۆ گەران بەدوای هاوسەرێكی نموونەیی ژیانو كارو پیشەی گونجاوت، بۆیە پەندەكە بریتییە لە خۆشەویستیو قۆستنەوەی ئەو دەرفەتەی كە ئێستا هەتە، كاتیش بەفیرۆمەدە!

# خوێندکارانی زانکۆ ڕۆژانە سەرقاڵی چین؟



خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی کاتەکانیان، چرکە ساتەکانی ژیانیان چۆنو بەچی بەسەر دەبەن؟

بەرنامەیان چییە بۆ ڕۆژانەی ناو زانکۆیان؟

خەیاڵو هیواو ئەندێشەیان بۆ ئایندەی خۆیانو نەتەوەکەیان چییە؟

ئایا بەرنامەیان هەیە بۆ دوارۆژی گەلەکەیان؟

خوێندکارانی زانکۆ ڕۆژانە زیاتر بە چییەوە سەرقاڵن؟ چی دەکەن؟

چەندێك هیوایان بە ئایندەی خۆیان هەیە؟

ئەمانە پرسیار گەلێکن کە وەڵامەکانیان لای خوێندکارانی زانکۆ دەست دەکەوێت! ئێمەش خواستمان ئەوەیە لەم ڕیپۆرتاژەدا کە خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی بدوێنینو بزانین ئایا خوێندکارانی زانکۆ جیاواز لە توێژو پێکهاتەکانی تری کۆمەڵگا دەژینو ژیانیان پڕە لە داهێنانو بەرنامە ڕێژی؟ یان بەپێچەوانەوە خوێندکاری زانکۆ بێ بەرنامەن بۆ ژیانی خۆیانو نەتەوەکەیان؟

خوێندکاران بۆخۆیان باس لەوە دەکەن کە ژیانیان دووبارەیەو هیچ گۆرانێکی تێدا نییە:

(بنار سەعید) خوێندکاری قۆناغی دووەمی کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلێمانی، دەڵێ: «ئێمە وەکو خوێندکاری زانکۆ هەموو ڕۆژەکانی ژیانمان دووبارەیە، چونکە کەدێیتە زانکۆ سەیردەکەی ئەوە نییە کە تۆ هەوڵت بۆداوەو بیرت لێ کردۆتەوە.

پرۆگرامێکی قورس، سبەینێ کە تەواویشت کرد هیچ ئاواتێکت نییە، چونکە ناگەی بە ئاواتی خۆت کە دامەزراندنە، ئەمانەش وات لێدەکات کە پێکەنینت بەوانەبێ کە لە ئامادەیی هەوڵ دەدەن، ئەڵێی سبەینێ تۆش هاتیتە زانکۆ وەك منت لێ دێ».

بناری خوێندکار باس لەوەدەکات کە هەر بە خەیاڵ بیر لەبەرنامە دەکەنەوە نابێتە ڕاستیو (واقیع)، ئەوان زیاتر لە ئاینده دەترسنو خەمی گەورەیان دوارۆژی خۆیانە.

بنار دەڵێ: «من بەرنامەم بۆ ئەمرۆش هەبێ خۆ سبەینێ دانامەزرێم، کەواتە بێ ئەنجامە! وەکو کەسێکی ون بوو نازانی بۆچی هەوڵ دەدەی».

بنار باسی خوشکێکی خۆی کرد کە پێنج ساڵ لە زانکۆ خوێندویەتیو ئێستا لەماڵەوە دانیشتووە «زۆر زیرەکیش بوو، ئێمەش وەکو ئەومان لێدێ، چۆن ئەو لەماڵەوە دانیشتووە گاڵتە بە ئێمە دەکات کە دەخوێنین، سبەینێ ئێمەش وادەبین».

خوێندکاران دەبینن ئەوانەی پێش خۆیان زانکۆیان تەواوکردووەو ئێستا بێکارن، لێرەوە هەست دەکەن ئەمانیش ئایندەیان ڕوون نییە، بۆیە بیر لەبەرنامە ناکەنەوە بۆ کاتەکانی ناو زانکۆیان، جگە لە محازەرە «وشکەکانیان» کاتەکانیان لەناو باخچەی زانکۆو کافتریا بەسەر دەبەن، زۆر کاتیش مۆبایل دەبێتە هاوڕێیەکی دوورو درێژیان!!.

(سنور ئەبوبەکر) خوێندکاری بەشی جوگرافی لەزانکۆی سلێمانی، بۆچوونی وایە: «زانکۆ هیچ جیاوازییەکی نیە لەگەڵ سەرەتاییدا بە بۆچوونی من، دەتوانم بڵێم سەرەتاییەکە باشترە، لەبەرئەوەی هیوایەکت هەیە دەڵێی دەچمە زانکۆ، بەڵام دێیتە زانکۆ هیچ ئاواتێکت نامێنێ، لەبەرئەوەی تۆ دەچیتە محازەرەوە مامۆستا هەروەکو سەرەتاییەکە وانەکانت پێ دەنوسێتەوە ئەگەر دووسێ پرسیار هەبێ دەکرێو دەچیتە دەرەوە، هیچی تر نییە، هەفتانە یەك جار کۆمپیتەر دەخوێنین ئەوەش هەر نەیخوێنین باشترە، چونکە هێندە بە پەلەو چوار پێنج خوێندکار لەسەر یەك کۆمپیتەرن دوای محازەرەش کە دێیتە دەرەوە، هەردەبێ بەناو حەوشەدا بسوڕێیتەوە هیچ بەرنامەیەکت نییە».

سنور باسی لەوە دەکرد کە لەناو زانکۆ بێ بەرنامە دەژین، ئەو دەیوت: کاتژمێر هەشتونیو دێینە زانکۆ، محازەرەیەکمان هەیە، هەموو خوێندکارەکان دەڵێن خۆزگە نەیخوێنینو بچینە حەوشە، دوایش چوار ساڵەکە تەواو دەکەی، دەبێ لەماڵەوە دانیشیت!!

سنور هۆکارەکەی بۆئەوە گەڕاندەوە کە گەنج ئێستا کەمتەرخەمەو گرنگی بە زانستو زانیاری نادات «ئەمەش دەکەوێتە ئەستۆی حکومەتو ئەو بەرنامەو پرۆگرامانەی لەزانکۆدا دەخوێندرێت، سیستەمەکە

## خوێندکارێک:
## ڕۆژانە هیچ بەرنامەیەکی وامان نییە، چونکە شتەکان هەموو دووبارەن

زۆر کۆنەو زۆر وشکە، خوێندکار تەحەمولی ناکات، سنور ئەوەشی وت کە زانکۆ جگە لە بیناو جلو بەرگ هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ناوەندیو سەرەتایدا، بگرە ئەوێ خۆشتر بوو».

سنور ئەو ڕاستیەی وت «دەبێ لەدەرەوە هەوڵ بدەی زانکۆ هیچت فێر ناکات».

لەکاتێکدا لە دنیادا بەردەوام باس لە وزەو تواناکانی گەنجانو خوێندکارانو ڕۆڵیان دەکرێت لە پێشکەوتنو گەشەپێدانی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگادا، بەتایبەتی بواری ئابوریو سیاسیو کۆمەڵایەتیو هۆشیاری، وەکو پێکهاتەیەکی نوێو کاریگەر باس دەکرێن، بەڵام لەکوردستاندا گەنجانو خوێندکاران زۆر لەم ڕۆڵەی خۆیان دوورنو دوورخراونەتەوە، ئەگەر گەنجان بۆخۆیان بەرنامەو پلانیان نەبێ، چۆن دەتوانن بۆ کۆمەڵگاکەیان خاوەن بەرنامەو پلان بن؟ کێ گەنجانو خوێندکارانی بەم ڕەوشە گەیاندووە؟!

خوێندکاری بەشی جیۆلۆجی (هەوراز قادر) دەڵێ: «لەراستیدا وەکو بەرنامە باوەڕ ناکەم هیچ خوێندکارێك بەرنامەی هەبێ لەزانکۆدا، لەبەرئەوەی من وەکو خوێندکارێك لەبەشی جیۆلۆجی دەخوێنم محازەراتمان زۆرە، کاتەکانی پشومان هەرئەوەندەیە کەمێك پشوو بدەین، تاوەکو خۆمان ئامادە بکەین بۆ محازەرەیەکی تر، وەکو بەرنامە هیچ بەرنامەیەکمان نییە».

هەورازی خوێندکاریش بە ئایندەی خۆیو



نا/ کاروان ئیبراهیم - زانکۆی سلێمانی

هاورێکانی ڕەشبین بوو:»بەداخەوە هیچ ئومێدێك یان ئایندەیەك بۆ پاشەڕۆژی نەك خۆم بەڵکو هیچ خوێندکارێك نابینمەوە، لەبەرئەوەی بێ پلانی دەسەڵات، لەهەمانکاتیشدا بێ پلانی کەسەکان خۆیان وایکردووە کە تۆ چاوەڕوانی هیچ بەرنامەیەك نەبێت بۆ ژیانی خۆت لە پاشەڕۆژدا، هەروەها سود نەبینین لە زانستو ئەو بوارەی تێیدا دەخوێنیت، ئەمەش وایکردووە هێندەی تر ڕەشبین بین لە ئایندەی خۆمان، بۆیە دەڵێم هیچ ڕۆشناییەك لە ئایندەی خۆمدا نابینمەوە».

هەوراز بەرپرسیارێتی ئەو ڕەوشەی گەنجان بە پلەی یەك دەخاتە ئەستۆی دەسەڵات، «دەسەڵات بوارێکی وای بۆ نەرەخساندوین، ئەوانەی زانکۆ تەواو دەکەن، لەماڵەوە دادەنیشن، ئەمە وات لێدەکات دڵت بە ئایندەی خۆت خۆش نەبێ».

ئایا چەندێك لەگەڵ ڕاستیو لۆژیکدا دەگونجێ گەنجان هەموو هۆکاری بێ بەرنامەیی خۆیان بگەڕێننەوە بۆ دەسەڵات؟ ئایا دەسەڵات گەنجان ڕزگار دەکات؟ یان گەنجان خۆیان دەتوانن خۆیان ڕزگار بکەن، قسەکردنی خوێندکارێك لەناو زانکۆدا گوزارشە لە قسەی سەدان خوێندکار، چونکە ڕەوشی گشتی خوێندکارانی زانکۆ وەکو یەکە، هەربۆیە کاتێك خوێندکاران دەدوێنی هەست دەکەی هەمان قسەی یەکتر دەکەن.

(شارا حەسەن) خوێندکاری قۆناغی دووی کۆلێژی زمان، تێروانینی وایە:»ڕۆژانە هیچ بەرنامەیەکی وامان نییە، چونکە شتەکان هەمووی دووبارەیە، لە پشووەکاندا یان بۆ کافتریا یان لە باخەکاندا دادەنیشین، سەبارەت بە موحازەرەو مامۆستا، محازەرەکانمان زۆر وشکە، مادەی وامان هەیە هیچ سودێکی بۆمان نییەو هیچیشی لێ تێناگەینو بە ڕێژەیەکی زۆریش خوێندکار لێی دەمێنێتەوە».

شارا وەکو خوێندکارانی تر ئەوەی وت:» ئێمە ئایندەمان نییە، چونکە چەندێك هەوڵ دەدەین بۆئەوەی بگەینە زانکۆو زانکۆ تەواو بکەین، بتوانین نەوەی تر پێبگەیەنین، بەڵام کوا؟ ئێستا دامەزراندن نییە، ئەمانەش وادەکات کە ئێمە بەرنامەمان نەبێ، چونکە چەندەها کەسی وەکو ئێمەش تەواویان کردووەو لە ماڵەوە بێکار دانیشتوون، هەروەکو ئەوە وایە کە نەیانخوێندبێ».

شارا باسی لەوەش کرد لە ڕەوشێکی وادا چارەنووسی کۆمەڵگا بەرەو دواکەوتوویی دەڕوات، چونکە کۆمەڵگا بەندە بە گەنجو بە خوێندکاری زانکۆو ئەوانەی تەواویان کردووە، بەڵام لەکاتێکدا کە خوێندکار نەتوانێ پەرە بە تواناکانی خۆی بدات کۆمەڵگا هەر بەرەو دواکەوتوویی دەڕوات».

خوێندکاری قۆناغی یەکەمی بەشی ڕاگەیاندن (سەردار قادر) دەڵێ:»ڕۆژانە دەچمە محازەرەکانەوە، دوای محازەرەش شوێنێکی وانییە بۆی بچی، شەوانەش زیاتر خەریکی کتێب خوێندنەوەم».

سەردار باسی لەوەش کرد خوێندکاری زانکۆ بەگشتی داهاتوویان زۆر ڕوون نییە»بەڵام من ڕەشبین نییم، هەرکەسەو دەبێ هەوڵ بدات، ژیانیش ئەوە نییە دەستەوستان بی لە بەرامبەریدا دەبێ هەوڵ بدەی».

سەردار جیاواز لە خوێندکارەکانی تر بیری دەکردەوە، ئەو لەبەرئەوەی قۆناغی یەکەم بوو زۆر نەکەوتبووە ژێر کاریگەری ژینگەی ناو زانکۆو توشی بێ ئومێدی نەببوو.

خوێندکارێکی تری قۆناغی یەکەم لە کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکان کە ناوی (حەمید محەمەد) بوو، باسی لەوەکرد:»پێش ئەوەی بێیتە زانکۆوە وەکو جێگەیەکی خۆش باسدەکرا، بەڵام بە داخەوە وانەبوو، هیچ گۆڕانێك ڕووینەدا، تا ئێستا هیچ سودێکم لە محازەرە نەبینیوە، ئەوە بۆ چەند مانگە دەوام دەکەین، مەگەر ڕۆژانە کتێبێك یان ڕۆژنامەیەك بخوێنینەوە هیچی تر».

(ئەمیر خواکەرەم) مامۆستا لەبەشی کۆمەڵناسی زانکۆی سلێمانیو خوێندکاری دکتۆرا، باسی لەوە کرد کە ئەم بابەتە زۆر گرنگە، ئەو وتی:»ئەوە گرنگە گەنج تا چ ڕادەیەك لە کۆمەڵگادا خۆی بدۆزێتەوەو باس لە ئایندەی خۆی بکات، ئایا ئەو ئایندەیە تا چ ڕادەیەك پرشنگدارە یان ئایندەیەکی شومە؟! گەنجی ئەم سەردەمە جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ گەنجی سەردەمەکانی پێشوو، گەنجی ئێستا خاوەن وزەیەکی بێ سنوورە، ئەگەر خۆی بیەوێ بە شێوازێکی تۆکمە سود لە تواناکانی خۆی وەربگرێ، لەم ڕوانگەیەوە کە خۆی سوودی لە تواناکانی خۆی وەرگرت بێگومان کۆمەڵگاش سوود لە تواناکانی وەردەگرێ، بۆیە لێرەدا پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا گۆڕانی شیرازەی خێزان ئەمانە کاریگەری لەسەر گەنج هەیە، گەنج بەشێوازێکی دیکە بیر دەکاتەوە».

مامۆستا ئەمیر باسی لەوەشکرد ئەکتیڤترین توێژ لە کۆمەڵگادا توێژی گەنجە، ئایا ئەم گەنجە چۆن بتوانێ تواناکانی خۆی پڕبکاتەوە، بۆ خزمەتکردنی خاكو نیشتمانەکەی، بەداخەوە گەنجی ئێستا هەستی نەتەوایەتی یەکجار لاواز بووە، ئەو لاوازبوونە وای لێدەکات کە خۆی بە خەڵکی ئەم نیشتمانە دەستنیشان نەکات، ئەمەش کۆمەڵێك هۆکاری لە پشتەوەیە، گرنگە لایەنی دەسەڵاتدار ئاوڕی لێبداتەوە».

مامۆستاکەی بەشی کۆمەڵناسی باسی ئەوەشی کرد ئەو گەنجەی ئێستا بێ بەرنامەیە ئەگەر بچێتە ناو دەسەڵاتیش سوود بە دەوروبەری خۆی ناگەیەنێ، بۆیە گەنج دەبێ خاوەنی بیرۆکەو پرۆژەو پلان بێ، بۆئەوەی کۆمەڵگاکەی بەرەوپێشەوە ببات، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ دەسەڵاتداران بزانن گەنج چی دەوێ، گەنجی ئێمە زانکۆ تەواو دەکات ڕەوا نییە دانامەزرێنن.

مامۆستا ئەمیر خواکەرەم بەرپرسیارێتی ڕەوشی گەنجان دەخاتە ئەستۆی گەنجان خۆیانو دایكو باوکیانو دەسەڵاتو مامۆستاکانیشیان، واتە: «سەرجەم لایەنەکان بەرپرسن لەوەی کە گەنج تووشی نامۆ بوون بووە، گەنج ئێستا خۆی نەدۆزیوەتەوە».

مامۆستا ئەمیر باسی لەوەشکرد: «کەپێویستە ڕێگا لەپێش گەنجان بکرێتەوە بۆئەوەی بەشداری لە وەزارەتەکانو دامودەزگاکانی حکومەتو پەرلەماندا بکات بۆئەوەی تواناکانی دەرکەوێو ڕۆڵی هەبێ، بەڵام دیسان دەڵێم ئەگەر دەسەڵات جارێك بەرپرسیارێتی هەیە لەو ڕەوشەی گەنجان ئەوا گەنج بۆ خۆی دووجار بە پرسیارە !!».

# راهێنانی مێشك



**به وردی لەم وێنەیە وردبەرەوە هێزی مێشكو بیركردنەوەت بخەرەكار**
**بزانە چی دەبینیت؟**
**تا چ رادەیەك دیدی تێروانینت وردە؟**

# ئاسۆی وێنەیەك

سەرنجی ئەم وێنەیە بدەو بە دیدو خەیاڵی تیژو هەستی ناسكت بۆی بنوارەو پاشان خامەكەت هەڵبگرەو گوزارش لەو هەستە ناسكو خەیاڵە وردو سۆزە بێ سنوورەت بكە، تا ببیتە خاوەنی یەكێك لەم دوو خەلاتەی خوارەوە:

**بەشداری بێ بەرامبەری ساڵێكی گۆڤاری بڕیار - بەشداری بێ بەرامبەری شەش مانگی گۆڤاری بڕیار**

پێدەچێت وێنەی ژمارەی رابوردوو ئاسۆیەكی هێندە فراوانی هەبێت كە تا دەرچوونی ئەم ژمارەیەش خوێنەرانی بڕیار دەستی تێرامانیان لەژێر چەناگەی خەیاڵیاندایە، بە نیازی نووسینی شاكارێكی بەرزن. لەبەر ئەوەش كە هیچ كام لە بەشداران گوزارشیان لەو ئاسۆ فراوانە نەكرد وەكو پێویست، بۆیە هەمان وێنەمان دانایەوە بەو ئومێدەی ئێوەی ئازیز بتوانن بە جوانترین وشە هەستی خۆتان لە ئاسۆی ئەو وێنەیەوە دەربڕن.






# لە ساڵڕۆژی بڕیاردا

خوا یاربێت لە ژمارە (١٢) دا، بڕیار مۆمی یەك ساڵەی خۆی دادەگیرسێنێو لەگەڵ خۆشەویستانی خۆیدا ئاهەنگی ساڵێك لە خزمەتو شەونخوونیو ڕاگەیاندنی ئامانجدار دەگێڕێت.

لە ساڵڕۆژی ڕاگەیاندنی پەیامی یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا، (بڕیار) حەز دەکات لەم یادەدا چیرۆكو مێژووی دامەزراندنی ئەم گۆڤارە بۆ خۆشەویستو عاشقانی خۆی بخوێنێتەوە!

بڕیار لە ژمارە (١٢)دا زۆر بە ڕاشکاوی پرسیارو تێبینیو پێشنیارەکانتان دەخاتە بەردەم خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەرو بۆ ئەم مەبەستەش پێتان ڕادەگەیەنین کە:

١- لە ٢٠٠٩/٣/٢٠ تا ٢٠٠٩/٥/١ دەتوانن پرسیارەکانتان لە ڕێگای ئیمەیڵو نامەو کورتەنامەی مۆبایلەوە بگەیەننە بڕیار.

٢- هەر هەڵوێستێکتان بەرامبەر بە بڕیار هەیەو هەر هەستێکتان لە ناخدایە بە ڕاشکاوی دەتوانن بەو ڕێگایانەی سەرەوە بۆمان بنێرن.

٣- هەر بابەتێك یان گۆشەیەك کە تا ئێستا لە بڕیاردا نییەو حەزدەکەیت هەبێت، دەتوانیت پێشنیاری بکەیت، خاوەنی جوانترین پێشنیاریش لە لایەن بڕیارەوە خەڵات دەکرێت.

٤- هەر گەنجو لاوێك لە کچانو کوڕان بەهرەمەندن لە هەر یەك لە بوارەکانی کۆمپیوتەر (فۆتۆشۆپ، ئەندیزاین، کوراڵ) دا حەزدەکەین پەیوەندی بکەن بە بڕیارەوەو سەردانمان بکەن بەمەبەستی کارکردن بەو مەرجەی بتوانن بە تەواوەتی (متفرغ) بن بۆ کارەکە.

٥- هەموو ئازیزێك بە ئامانجی بەرەو پێش بردنو دەوڵەمەندکردنی گۆڤارەکە دەتوانێت بە (ڕیپۆرتاژ -چاوپێکەوتن- وێنەی مانا بەخش، یا هەر بابەتێك کە جوانو شیاوە) بەشداریی لە بڕیاردا بکات.

بڕیار گۆڤاری هەمووانەو موڵکی هەموو کوردێکی نیشتمان پەروەرە، پێویستە وەکو سۆمای چاوەکانمان بیپارێزینو بەردەوام خزمەتی بکەینو وەکو پەروانەی دەوری شەم لە ژوانی ئەودا کۆڕی هیواو ئەوین گەرم بکەین.

چاوەڕوانتانین

یەکەم کەناڵی کەرتی تایبەت




2006.3.21
یەکەم مۆڵەتی یاسایی ژمارە



# پیرۆزە چوارەم ساڵیادی نیگا

www.NigaTV.com




نیگایەك بۆ هەمووان

### ڕێباز:

★ نیگا TV، تێدەکۆشێت لە پێناو خزمەتکردن بە مێژوو کلتورو هونەرو ڕۆشنبیری بۆ هێنانەدی گۆرانکاری لە کۆمەڵگە.

★ بەڵام یەکەم هەنگاوی سەرەکی بریتییە لە خزمەتکردن بە پەیامی بازرگانی بۆ وەرچەرخانو هەڵسانەوەی ژێر خانی ئابوریو کێبەرکێ دروستکردن لە نێوان کۆمپانیاکان بە ئامانجی نەهێشتنی قۆرخکردنو دەسخەڕۆکردنی خەڵك لەسەر بنەماکانی بازاری ئازاد.

★ نیگا TV، لە باشترین حاڵەتەکانیدا هەست بە لێپرسراوێتی دەکاتو بە ئەمانەتیشەوە ئەم ئەرکەی خستۆتە ئەستۆی خۆی، تاوەکو ببێت بە بەشێك لە ڕێبازی ڕۆشنگەری.

### درووشم:

نیگایەك بۆ هەمووان

واتە هەمە لایەنە دەروانێتە ئاینو ئاینزایەك، هەمە لایەنە دەروانێتە گشت حیزبو ڕێکخراوێك، پابەندیشە بە پاراستنی بنەما نیشتمانییەکان.

نیگا، ستایش نییە بە هیچ کەسێكو ڕێکخراو حزبێك، بەڵکو تەنها لە دایکبووی نوێترین گۆرانکارییە کە بێ سڵەمینەوە بتوانێت خزمەت بەو چەمكو واتایانە بکات کە هەموو کات هەڵگری پەیامی ئەو چەمكو واتایانە نەگۆڕەو هەموو کەسیش بە ئاسانی دەتوانێت لە ئامانجو مەبەستەکانی تێ بگات.

نیگا هەڵێنجراوی ئەو بیرکردنەوانەیە کە ژیان بەو سادەییە دەبینن، وەك چۆن ئازادیش لە خودی خۆیدا سادەترین مافی سرووشتییە بۆ گشت مرۆڤەکان.

### ئامانج:

نیگا TV، لە پێناو خزمەتکردن دامەزراوە وەك لەمەو پێش باسمان کرد، وشەی خزمەتیش هەرکەسەو پێناسەو ناسینی بە شێوەیەك دەردەبڕێت کە باس لە کرۆکی خزمەتەکە بکات، هەر بۆیە خزمەت بە مەفهومی نیگا واتە:

★ بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری.

★ درککردن بێ گوێدانە هەر کەمو کورییەك، کارکردن لە پێناو گۆڕینی واقیعی بیرکردنەوەمان.

★ هەستانەوە جارێکی تر ڕووبەڕوو بەرامبەر حاڵەتە نەشیاوەکان کە پەیوەندی بە تاکی کۆمەڵگەوە هەیە.

★ ڕاهێنانی ئەو گەنجانە کە تینووی شتە مەخلوق بەخشەکانن.

★ تەماشاکردنی ئەمرۆ بێ هیوا نەبوون لە دوا ڕۆژ.

### پرۆگرامەکانمان:

★ ماوەی منداڵان/ فیلم کارتۆنو زنجیرە کارتۆنو ژێرنووس، کورتە کارتۆن، فێرکاری، ئۆپەرەیت، چیرۆك، گۆرانی منداڵان، بەرنامەی منداڵان.
★ بەرنامەی دۆبلاژ/ هونەری، زانستی، سەیروسەمەرە، کامێرای شاراوە، بابەتی دیکۆمێنتی لە گشت بوارەکاندا.
★ بەرنامەی کوردی/ فۆلکلۆری، تەرفیهی، دیکۆمێنتی کوردی، بەرنامەی وەرزی.
★ وەرزش/ یاری تۆپی پێ، ڕاپۆرتی وەرزشی.
★ زنجیرەی خێزانی/ ژێرنووس، دۆبلاژ.
★ گۆرانی کوردی وەك ریفرێش لە نێوان پرۆگرامەکان.
★ دوا بابەتی شەو/ فیلمی ژێرنووس، فیلمی دۆبلاژ، تەمسیلی کوردی.

# جوانی



یوسف واژەیی

بە چاوێکی بێ تروووکان‌و تامەزرۆوە بۆ دەوروبەرم دەڕوانم چی بنووسم؟ چۆن دەتوانم؟

ئەم هەموو جوانییە زۆرو خواکردە بێ سنوورە کە لە تواناو قەڵەمی من گەلێ دوورە پێناسی کەم‌و بەم ساناییە باسی بکەم.

بە شەوگاران هەر لەگەڵ یەکەم وچانی شەو بێداران سەری پڕ تاسەو ئاواتم کە هەڵئەبڕم بەرەو گۆڕەپانی پان‌و بەرینی ئاسمانی ساماڵ.

زەماوەندی ئەستێرەکان بەم نووتەک‌و شەوە زەنگە. ئاهەنگی بووکی ڕازاوەی مانگی مەنگە بەسەر پشتی کاکێشانا بەڕێکەوتوون. دە بڕوانە ئەم هەموو زەماوەند گێڕە بێ خورپەو چرپەو بێدەنگە. مانگی شەنگیش تارای خەرمانەی پۆشیوە چاوی عەشق‌و خۆشەویستی لە زەوی ئازیز بڕیوە. ئەم دیمەنە نەك هەرمنی بێخودو سەرسام کردووە، نا بەڵکو تاق تاقە کەریشی شەیداو بێ ئارام کردووە. بەم پێیە دانگە ئەم ئاهەنگە بە ڕێدەکەن نەرم نەرم.

هەتا کاتێ خۆری گەرم سەرچۆپی لە دەستی ئەستێرەکان وەردەگرێت‌و هەزاران گورزە تیرۆژی پیرۆزی خۆی وەکو دیاری دەبەخشێتە بووك‌و زاوا.

دەیبەخشێتە دۆڵ‌و دەشت‌و سەخت‌و تەخت‌و ڕازو هەوراز، دەیبەخشێتە چیاو چۆڵ‌و دەریاو زەریا، شاخ‌و باخ‌و گوڵ‌و گەڵا، پیرۆزبایی ڕۆژێکی نوێ ئەداتە هەر شارو گوندو کونج‌و شوێنێ، هەموو جێگەیەك ئەدوێنێ، یەکەم جێگەش سەری کوڵمەی لوتکەی چیا ڕائەمووسێ..

پایزێکی درەنگ وەختێ پێش ئەوەی کە خۆرەتاوی کزو کەم تین، بچێتە باوەشی ئاسۆو کەناری سوور ئامێزی خۆر نشینی دوور، بکاتە هێلانە بۆ خۆی، دانە دانە گەڵای نیوە زەردو تەزیو دەکەونە بەر پێی درەختی کە سیرە بووی قژ هەڵوەریو.

گیای نیوە گیان کزەبای سارد بە دەستە بێ میهرەکانی چل چل ئەیکا ئەمدیواو دیو. هەناسەی بەتەم‌و مژی سەرماو سۆڵە چۆلەکە ئەکاتە گرمۆڵە، ئەوەی کەوا گیان لەبەر بێت ئەم تەوژمە کردوویە مات‌و کزۆڵە.

شەوی یەڵدا گۆڕەپانی دەستەو یەخەو زۆران بازی پایزی پەرچەم زێڕین‌و زستانەکەی ڕیش چەرمووە، کە سەرەنجام لە یەکێکیان میوانییەو یەکێکیان فەرموو فەرمووە. زستان ئەو میوانە هات‌و ناسراوەیە، کە ئەوەندە دەست‌و دڵی کراوەیە، ئەو پۆشاکە سپی‌و سۆڵە ئەو سەختی‌و شەختەو سەهۆڵە، بەشی هەرچی چیاو چۆڵە هەرچی شاخ‌و داخ‌و دۆڵە ئەداو ئەکا، هەموو گوێی گوێسەوانەیەك، گوارەی چلورەی پیا ئەکا، لوتکەی بەفرین بە چاوبرکێی لەگەڵ تیشکی خۆری بەتین لە شەرمانا زەنگۆڵ زەنگۆڵ ئەتوێتەوە، فرمێسك بۆ تەمەنی خۆی هەڵئەرێژێ جا لە داخا ڕۆ ئەچێ بە ناخی ئاخا، پاش پڕ بوونی دڵی زەوی لە ناو چەندین مێرگ‌و باخا لە ژێر هەرەس‌و ڕەوەزو لە دامێنی زورگ‌و شاخا جارێکی تر لە دامێنی چەندین کارێزو کوێرە کانی هەڵئەقوڵێ‌و دێتەوە دەر بە ئاوازی قوڵپ‌و هوری هەڵقوڵینی ئاوی کانی وردە بەردو زیخەکانی ئەکەونە سەماو گۆرانی، زوڵاڵ زوڵاڵ سازگارو ڕوون دوای بڕینی سەدان بن بەردو پێچ‌و بێروون دوای بوون بە چەندین قەڵبەزە بەو خورەو هەڵبەز هەڵبەزە پاش ئاودانی چەندین پنج‌و گوڵ‌و ڕیشاڵ هەندێکی نغرۆ ئەبێتە ناو کون‌و چاڵ، هەندێکیشی بە هەڵم‌و تەم، پاش ماوەیەك ئەڕژێتە چەم، چەمیش بە هاژەو شڵپ‌و هوڕ، بەو هەموو جووڵەو گۆرانەی دێ بە سەریا بەرەو دەریا، دەریاش زەریا بەرگێکی شینی ئاسمانی سەرتاپا ئەکا بەبەریا.

شنەی شەماڵ مژدەو هەواڵی تازەی ساڵ، بۆ هەموو نێرگزە جارو هەردوو وەردو تەرت‌و بژوێنێ ئەهێنێ، کاکۆڵی هەموو نزارو پیرە دەوەنێك دادێنێ باڵای قەرسیلی گەنم‌و جۆی ناسك بە کەروێشکە دێنێ ئاونگ لە گوڵ ئەفرێنێ، تووڵی ئەمامی شلك‌و تەرزی بێستان‌و ئەگریجەی ڕەزە دێمان ئەلەرزێنێ.

لەگەڵ یەکەم هەناسەی بەری بەیانی پاساری لە گوێسەوانەو هەموو باڵندە هاوشێوەو هاورێکانی، دوای ئەوەی کەوا کەڵەشێر هەموو بەیانی ئەم جارەش بە خەبەر هانی، ئەوانیش وەك ئێمەی مرۆ سەرگەرم بەکارو بژێوو بژێو، ئەکەونە ساراو کەژو کێو، ڕۆین گەڕان گەڕانەوە هاتن‌و چوون بە یەکدا چوون مانای زیندوێتی‌و ژینن چاوەکانمان تەنها جوانی تیا ئەبینن.

# خێزانی بەختەوەر

دایکی سرووش



## با خێزانەکانمان لەسەرووی هەموو کارەکانمانەوە بن!!

پیاوی نموونەیی کەسێکی رێکوپێکە لە کاروبارەکانیدا، هەمیشە لەهەوڵداندایەو تواناکانی دەخاتە کار بۆ ئەو گرفتانەی رووبەرووی دەبنەوە.

جڵەو بۆ هەڵچوونەکان شل ناکات بە شێوەیەک کە لە رەفتارو گوفتاریدا دەربکەوێت و دڵی خێزانەکەی زیز بکات، پیاوی نموونەیی بەشێوەیەک ژیانی خۆی رێکدەخات کەبە هەماهەنگی لە نێوان کارەکانی و ئەرکی ماڵ و خێزانەکەیدا دڵنیایی و ئاسودەییەکی تەواوی بۆ خێزانەکەی دروستکردووەو زۆر خۆشحاڵە لەهەڵس و کەوت و گوفتاریدا.

چونکە بەراستی پەیوەندی نێوان ژن و مێرد تەنها پەیوەندی نێوان دووکەس نییە، بەڵکو لایەنی سێیەم تیایدا بەشدارە وەک سێ لای سێگۆشەیەک پێکەوە! ئەویش مامەڵەکردنی راستەقینەیە لە ژیانی هاوسەریدا. کاتێک دەڵێین: مامەڵەکردنی راستەقینە واتە درککردن بە بایەخدان بەکارە جوانەکان و تێگەیشتنێکی راستیانە لەمانای بەرنامەرێژی بۆ ژیانی هاوسەرێتی و پێشخستنی کارە گرنگەکانی خێزانەکەی و جێبەجێکردنی کارەکانیان بەدانایی و زانایی.

لەژمارەی رابووردودا باسمان لە پێشخستنی کاروبارەکانی هاوسەر لەلایەن ئافرەتانەوە کرد بە پشتیوانی خودا لەم ژمارەیەدا باس لە پێشخستنی کاروبارو پێداوستیەکانی ئافرەتان لەلایەن پیاوانەوە دەکەین.

بەراستی شتێکی بەڵگە نەویستە کە پیاوان بە گشتی ئەرکی دابینکردنی بژێوی خێزانیان کەوتۆتە ئەستۆ، بەلام دەبێت پیاوان لەوە دڵنیا بن کەتەنها پەیداکردنی پارەو سەروەت و سامان کۆکردنەوە نابێتە مایەی سەرکەوتنی ژیانی هاوسەرێتی، بەڵکو بایەخ نەدان بە گرنگی ئەم کارە هەڵەیەکی گەورەیە.

دەبێت پیاوان رێگە نەدەن هۆگری تەنیای دوور کەوتنەوە لە خێزانەکەیان ببن، پێویستە لەسەر پیاوی دڵسۆز هەموو تواناکانی تەرخان بکات بەوەی ئەو کارەی جێبەجێی دەکات بەراستی لەپێناوی خێزانەکەیدا بێت، ئەو کاتە ماڵەکەی و خێزانەکەی لە چوارچێوەیەکی راستدا داناوە.

پیاوان دەبێت بزانن ژیانی هاوسەرێتی قۆناغێکی نوێیەو جودایە لە ژیانی پێشتر، دەبێت بزانین پێش ئەوەی ژیانی هاوسەرێتی پێک بهێنن ئەرکەکانمان کەمتر بوون لەدوای ژیانی هاوسەرێتی، هەروەک زانایەک دەڵێت: (هەموو شتێک لەدوای ژیانی هاوسەرێتی دەگۆڕێت بە تایبەت تۆ دەبێت یەکێک بیت لەو شتانە).

بەداخەوە هەندێک لە هاوسەران پێش ژیانی هاوسەرێتیان کاتێکی زۆریان لە گەڵ هاورێکانیاندا بەسەر بردووە، بەهەمان شێوە دوای هاوسەرێتی بەردەوام دەبن لە گەرانەوەیان لەکاتێکی درەنگی شەودا، کە هیچ هۆشیان لە لای خێزانەکەیان نیە، بەراستی بەسەربردنی کات لەگەڵ خێزانەکەتدا زۆر بە بایەخ ترە لە بەسەربردنی لەگەڵ هاورێکانتدا، چونکە بە گرنگیدانت بە خێزانەکەت گوزارش لەو پەری مانای وەفاداری و دڵسۆزیت دەکەیت.

بەکورتی بۆئەوەی پیاوێکی نموونەیی بیت و چاودێری مافداریی خێزانەکەت بکەیت و پێداوستیەکانی خێزانەکەت لە سەرووی هەموو کارەکانتەوە بێت، پێویستە رێنمایی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەیت:

١- بایەخدان بەدەست رەنگینییەکانی خێزانەکەت، بۆ ئەوەی بتوانیت خێزانەکەت بەرەوپێشەوە بەریت، هەمیشە هەوڵبدە خێزانەکەت لە چ بوارێکدا بە تواناو زیرەکە هانی بدەو ستایشی بکە، نەک وەک کەسێکی نەزان و بی نرخ تەماشای بکەیت.

٢- هەرگیز خێزانەکەت بە کەم مەزانەو بە چاوێکی سووک تەماشای پێداوستیەکانی مەکە، چونکە ئەم کارە ئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوەو کاردەکاتە سەر کەسایەتی خۆت و خێزانەکەت.

٣- ئارامی و لەسەر خۆیی و تورەنەبوونت کاریگەرییەکی زۆری هەیە بۆ پێشخستنی خێزان و منداڵەکانت لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

٤- سنگفراوان بە لەگەڵ منداڵەکانتدا بچووک بن یاخود گەورە، چاودێری خوێندنیان بکە، دابنیشە لەگەڵیاندا، گوی لە هیواو ئارەزووەکانیان بگرەو کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکە، هۆگری تەنیاییان مەکە.

٥- پیاوی سەرکەوتوو هونەرمەندە لە رێکخستنی ژیانی رۆژانەو هەموو بوارەکانی ژیانیداو هەموو شتێک مافی خۆی دەداتی، پیاوێک کە سوورە لەسەر دانانی کاتی گونجاو بۆ حەوانەوەی لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەیدا توانیوەتی گرنگی بوونی خۆی دروست بکات لای خێزانەکەی.

٦- ژیری و زیرەکیت لە مامەڵەکردنتدا رۆڵێکی گرنگی هەیە بۆ پێشەنگیت لە ماڵەکەتدا. بۆ نموونە کاتێک خێزانەکەت داوای جێبەجێکردنی کارێکت لێدەکات ئەمە مانای خۆشەویستی و رێزە بۆ تۆ، چونکە تەنها کەسێک بە شیاوی بزانێت بۆ بەرێوەبردنی کارەکانی تۆیت.

٧- پیاوی نموونەیی ئەوکەسەیە کاتێک دەگەرێتەوە خەمەکانی لە دەرەوەی ماڵەکە بەجێدەهێڵێت، نەک غەمباری و بێزاری و بێدەنگی هەڵبژێرێت لەماڵەکەیداو خۆی و خێزانەکەی دڵتەنگ بکات.

٨- بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بیت هەمیشە رێزو خۆشەویستی بنوێنە بۆ خێزانەکەت، کاتێک قسەت بۆ دەکات گوی بۆ قسەکانی بگرە، خۆت سەرقاڵ مەکە بە شتێکی ترەوە، چونکە زۆربەی ئەو کێشانەی رووبەرووی خێزان دەبێتەوە بە هۆی گوی نەگرتن و بایەخ نەدانە بە بیرو بۆچوونەکانی یەکتر.

٩- هەوڵبدە هەمیشە قسەخۆش و رەفتار جوانی هەڵبژێریت لە گەڵ خێزان و منداڵەکانتدا، نەک قسەخۆش و روخۆش بیت لە دەرەوەی ماڵەکەت، بەلام بە گەرانەوەت بۆ ماڵەوە ببیتە کەسێکی تورەو بێزارو توندو تیژ..

سود لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە: پیاوی باش واتە هاوسەرگیری سەرکەوتوو: روبرت مارك ئەلتەر

# هاورێیەتی منداڵ بکەو
# ببە بە پێشەنگ و نموونە بۆی

ئا: پارێزەر ئازاد محێدین

بۆ ئەو باوك‌و دایكانەی كە ئاواتەخوازی چاكەو خێری منداڵەكانیانن، بۆ ئەو كەس‌و لایەنانەی كە ئەركی پەروەردەكردنی منداڵیان لە ئەستۆدایە.

هاورێیەتی رۆڵێكی كاریگەری هەیە لەسەر دەروونی منداڵ، بۆیە پێویستە لەسەر دایكان‌و باوكان‌و مامۆستایان یان هەر كەسێكی تر كە رۆڵی پەروەردەكار دەبینێت هاورێیەتی منداڵ بكات، بە هیچ شێوەیەك خۆی بە گەورەترو زیاتر نەزانێت‌و خۆ بەكەم زانین بنوێنێت‌و بیكاتە دروشمی خۆی لە بەرامبەر منداڵدا، بەم كارەش منداڵ هەموو ئەو شتانە فێردەبێت كە گەورەكان ئامانجیانە بیگەیەنن بە منداڵەكان.

پەروەردەكاری سەركەوتوو ئەو كەسەیە كە كاتێك كۆمەڵێك منداڵی بینی یاری دەكەن‌و كات بەسەر دەبەن هانیان بدات بۆ ئەو گیانی پێكەوە كاركردن‌و یاریكردنە نەك لە یەكیان جیا بكاتەوەو لێیان تورەبێت.

هەروەها پێویستە لەسەر پەروەدەكار بە تایبەت دایكان‌و باوكان كە هاورێی باش‌و رەوشت بەرز بدۆزنەوە بۆ منداڵەكانیان، چونكە منداڵ لەو تەمەنەدا هەستی لاسایی كردنەوەو چاولێكەری زۆر تێدا بەهێزە، ئەگەر دەوروبەری بەتایبەت هاورێكانی باش‌و رەوشت بەرزبن چاویان لێدەكات، بەهەمان شێوە ئەگەر خراپیش بن هەر چاویان لێدەكات.

بەهەمان شێوە بوون بە (پێشەنگ) كاریگەرییەكی زۆری هەیە لەسەر دەروونی منداڵ، چونكە منداڵ لە زۆرینەی كارەكانیدا لاسایی‌و چاولێكەری كەسانی گەورەی دەوروبەری دەكاتەوە بەتایبەت باوك‌و دایكی، تەنانەت لە ئایین‌و بیرو بۆچونیشدا، كەوابوو پێشەنگی لە كاراترین هۆكارەكانی دروستكردنی كاریگەرییە لەسەر دەروونی منداڵ.

پێویستە لەسەر پەروەردەكاران كە لە كردارو گوفتاریاندا راستگۆ بن بەتایبەتی لە كاتێكدا كە مامەڵە لەگەڵ منداڵدا دەكەن، چونكە درۆ كردن بە كردار شوێنەواری خراپتر بە جێدەهێڵێت لەسەر منداڵ وەك لە درۆی گوفتاری.

بۆبەرچاو روونی بەرێزت‌و ئاشنا بوونت بە درۆی كرداری نموونەیەك دەهێنینەوە:

گومان لەوەدا نییە كەمنداڵان چاودێری سەرجەم هەڵس‌و كەوتەكانی گەورەكان بە تایبەت دایكان‌و باوكانیان دەكەن‌و دوبارەی دەكەنەوە لە ژیانی خۆیاندا، ئەگەر راستگۆییان بەدیكرد ئەوە بێگومان راستگۆ دەردەچن، لەماڵەوە دایكان‌و باوكان دەبنە نموونەو پێشەنگ بۆ چاولێكرانیان، لە لایەن منداڵانەوە، بەڵام لە قوتابخانەدا مامۆستا رۆڵی پێشەنگی دەبینێت. بۆیە زۆر گرنگە كاری دژ بەیەك ئەنجام نەدرێت لەبەر چاوی منداڵدا، مەبەست لەكاری دژ بەیەك ئەوەیە كە پەروەردەكار بە منداڵ بڵێت درۆكردن كارێكی خراپ‌و بێزراوە بەڵام ئەو كەسە خۆی درۆ بكات یان بە منداڵ بووترێت پێویستە پێش نانخواردن دەستەكانمان بشۆین بەڵام ئامۆژگاریكار خۆی بە دەستی پیسەوە نان بخوات.

سروشتی منداڵ بە جۆرێكە كە حەز بە فێربوون دەكات لە كەسانی دەوروبەرییەوە، زۆر جار دەستبەجێ هەڵسوكەوتی دەوروبەری وەردەگرێت‌و لە خۆیدا دوبارەی دەكاتەوە، بەڵام هەندێ جار پرسیار دەكات پاشان لە خۆیدا دوبارەی دەكاتەوە، بۆیە زۆر پێویستە لەسەر پەروەردەكاران بەتایبەت باوكان‌و دایكان كە بواری پرسیاركردن بدەن بە منداڵان‌و بەوپەری نەرم‌ونیانی‌و سنگ فراوانییەوە بە شێوازێكی جوان‌و ئاسان وەڵامی پرسیارەكانیان بدەنەوە.

بۆیە پێویستە منداڵان بەكەم نەزانین، چونكە ئەوان بەردەوام چاودێری هەڵس‌وكەوتمان دەكەن‌و هەوڵ دەدەن هەمان هەڵسوكەوتی ئێمە لە خۆیاندا دوبارە بكەنەوەو پیادەی دەكەن.

لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین كە بوون بە پێشەنگ لە پەروەردەدا لە سەركەوتوو ترین‌و كاریگەرترین هۆكارەكانی ئامادەكردن‌و راهێنانی منداڵە لەرووی كۆمەڵایەتی‌و دەرونی‌و رەوشتییەوە.

هەر لەبەر ئەوەشە كە پێشینەكان زۆر گرنگییان دەدا بە هەڵبژاردن‌و دۆزینەوەی باشترین پەروەردەكار بۆ منداڵەكانیان، بۆ نموونە زانایەك نامەیەكی نووسی بۆ پەروەردەكاری كورەكەی كە لە بەشێكیدا هاتبوو: (با یەكەم چاكسازی‌و خزمەت كە پێشكەشی كورەكەمی دەكەیت چاكسازی خودی خۆت‌و هەڵس‌و كەوتت بێت، چونكە منداڵان چاویان تیژە لە بینینی هەڵسوكەوتی چاك‌و خراپەوە).

خوێنەری بەرێز بۆ ئەوەی زیاتر رۆڵی گرنگی‌و لایەنی چاكی‌و خراپی ئەركی بوون بە پێشەنگمان بۆ روون ببێتەوە، با گوێبیستی مامۆستا (محمود ماهر زیدان) بین كە لە كتێبی (پاداشت‌و سزا) دا بۆ مان دەگێرێتەوەو دەڵێت: (جارێكیان بانگێشت كرابووم بۆ بەشداریكردن لە ئاهەنگێك كە لە یەكێك لە قوتابخانە سەرەتاییەكاندا ساز كرابوو، لە ناو یەكێك لە پۆلەكانی پێنجی سەرەتاییدا قوتابییەكان داوایان لە هاورێیەكیان كرد لاسایی مامۆستاكانیان بۆ بكاتەوە، ئەویش رەزامەندی نیشانداو وتی: ئێستا لاسایی مامۆستای ئینگلیزی دەكەمەوە: لە پۆلەكە چووە دەرەوەو دەرگاكەی داخست‌و پاش خولەكێك بە خێراییەكی سەرنج راكێش هاتەوەو بە شەق دەرگاكەی كردەوەو بە تورەییەوە بە قوتابییەكانی وت:

(Good morning dogs) واتە بەیانیتان باش....؟!!

پاشان قوتابییەكە وتی ئێستاش لاسایی مامۆستای بیركاریتان بۆ دەكەمەوە: پرسیارێكی دەربارەی خشتەی لێكدان ئاراستەی یەكێك لە هاورێ قوتابییەكانی كرد، قوتابییەكە وەڵامی ناراستی دایەوە، هەمان پرسیاری ئاراستەی قوتابییەكی دی كرد، دەستبەجێ بەراستی وەڵامی دایەوە، بۆیە داوای لە قوتابی یەكەم كرد كە لەسەر زەوی بە دەما بكەوێ‌و داواشی لە قوتابی دووەم كرد كە وەڵامەكەی راست بوو كە بەهەردوو قاچی بچێتە سەر ملی قوتابی یەكەم، ئەوانیش لە بەردەم ئامادەبووان ئەم كارەیان جێبەجێكرد.

لەم كاتەدا یەكێك لە مامۆستاكانی قوتابخانەكە بە روویەكی نا ئاسایی‌و شەرمەزارییەكەوە داوای لە ئامادەبووان كرد كە بفەرموون شیرینی‌و خواردنەوەكانی بەردەمیان بخۆن..........

مامۆستا (محمود) دەڵێت: دەستبەجێ هەستم كرد بۆیە مامۆستاكە لەم كاتەدا بەخێرایی پێشوازیی لێكردین، بۆ ئەوەی چیتر بوار بەو قوتابییە نەدات پەردە لەسەر پەروەردە نادروست‌و نهێنییەكانی تریان هەڵماڵێت! پاشان مامۆستا (محمود) دەڵێت بە دڵشكاوی‌و خەم‌و خەفەتێكی زۆرەوە لە قوتابخانەكە هاتمە دەرەوەو دەیان پرسیاری ئاڵۆز لە مێشكمدا دروستببوون، ئایا دەبێت پەیوەندی نێوان مامۆستاو قوتابی ئاوها بێت؟! ئەمە چ جۆرە هەڵسوكەوت‌و بەهاو رەوشتێكە ئێمە دەی روێنین لە دەروونی ئەو قوتابییە رۆح سووك‌و پەپوولە ئاسایانەی كە هێشتا سەرەتای رێگەیانە لە ژیاندا!

ئەم منداڵە لە داهاتوودا چاوەرێی چی لێ بكەین، لە كاتێكدا لەلایەكەوە دەبینێ مامۆستاكەی لە قوتابخانە بە جنێوو قسەی ناشیرین‌و قێزەوون‌و (بێزراو) مامەڵەی لەگەڵدا دەكات! لەلایەكی ترەوە دەبینێ دایكی درۆ لەگەڵ باوكیدا دەكات، یان بە پێچەوانەوە یان هەردووكیان لەگەڵ خزم یان دراوسێكەیاندا، لەلایەكی تر باوكی پێی دەڵێت: برۆ وەڵامی تەلەفۆنەكە بدەرەوەو پێی بڵێ: باوكم لە ماڵ نییە یان دایكم لەماڵ نییە!

بۆیە بەدڵنیاییەوە ئەگەر منداڵ لە كەش‌و بارودۆخێكی لەم شێوەیەدا پەروەردە ببێت ئەوا بە هیچ شێوەیەك فێری كرداری راست‌و دروست نابێت!

لە لایەكی ترەو دەبینێ دایكی خیانەت (ناپاكی) لە باوكی دەكات! یان باوكی لەگەڵ دایكی! لە بارودۆخی هاوشێوەی لەمەشدا هەرگیز منداڵ فێری پاكی‌و متمانە نابێت.

لە لایەكی تر دەبینێ دایكی یان باوكی یان هەردووكیان زمان پیس‌و جنێو فرۆشن بۆیە هەرگیز فێری رێزو گەورەو بچووكی نابێت!

لە لایەكی تر دەبینێ باوكی یان دایكی تورەو زبرن لەگەڵ منداڵەكانیان یان لەگەڵ كەسانی دەوروبەریاندا، بۆیە هەرگیز فێری بەزەیی‌و نەرم‌و نیانی‌و هاوكاری نابێت.

لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر دایكان‌و باوكان‌و مامۆستایان یان هەر كەسێكی تر كە ئەركی پەروەردەكردنی منداڵیان لە ئەستۆدایە وریابن!!

نەكەن بەگوفتار ئامۆژگاری منداڵ بكەن، پاشان بەكردەوە پێچەوانەی گوفتاریان پەیرەو بكەن! چونكە ئەگەر منداڵ بەم شێوەیە پەروەردە بكرێت ئەوا لە پاشە رۆژدا كەسێكی ناراست‌و دووروی لێدەردەچێت، پاشانیش زۆر مەحاڵە بتوانێت ئەو هەڵەیەت راست بكەیتەوە!

# 20 ڕێگە بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی منداڵەکەت!!

ئا/ بەرزان ئەبوبەکر

١- بەشێك لە کاتەکانت بە جیا لەگەڵ منداڵەکانت بەسەربەرە، دەتوانیت لەگەڵ یەکێکیان ژەمە خۆراکێك بخۆیت لە دەرەوەی ماڵ، لەگەڵ یەکێکی تریان کەمێك وەرزش یان پیاسە بکەیت، یان تەنها لەگەڵیدا بچۆرە دەرەوە، گرنگ ئەوەیە کە ئەوان هەست بکەن کە تۆ دەتوانیت ڕێزی هەموویان بگریت، بێ ئەوەی جیاوازی لە نێوانیاندا بکەیت، زۆر بە داد پەروەرانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکە، بەمەش وادەکەیت کە منداڵەکانت هەمیشە پێشبرکێ بکەن بۆ بە دەستهێنانی نازناوێك لەلای تۆ، هەروەها بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی تۆ.

٢- هەوڵبدە لە ڕێگای هاندانیانەوە متمانە بەخۆبوونیان لەلا دروست بکەیت، بەشێوەیەك کە هەرکەس لەوان پشت بەخۆیان ببەستن بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی ڕۆژانەیان، هەروەها ڕێز لە هەوڵو کۆششەکانیان بگرە، بەڵام ئەوەش بزانە تەنها ڕێز گرتن ئاکامی نابێت، وەکو زۆربەمان ئەو هەنگاوە پیادە دەکەین، بەڵکو پێویستە هاندانەکانت مادیو مەعنەوی بێت.

٣- ئاهەنگێ ساز بکە بە بۆنەی دەستکەوتەکانی منداڵەکانتەوە، بۆ نموونە هەستە بە ئامادەکردنی خوانێکی تایبەت لەبەرئەوەی فلان منداڵت ئەمرۆ ررۆژی سەرکەوتنێتی لە خوێندندا، یان منداڵێکی ترت بەشداری کردووە لە تیپی تۆپی پێی قوتابخانەکەیو سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، یان منداڵی سێیەمت لە تاقیکردنەوەدا نمرەی باشی بەدەستهێناوە، بەم شێوەیە با هەریەك لە منداڵەکانت بزانن کە تۆ گرنگی بە خۆیانو ڕووداوەکانی ژیانیان دەدەیت، بەڵام ئاگاداربە ئەم کارەت تەنها لەگەڵ منداڵێکیان نەکەیتو ئەوانی تر فەرامۆش بکەیت، تەنانەت ئەگەریەکێك لە منداڵەکانت هیچ دەستکەوتێك یان ڕۆڵێکی نەبوو، بەڵکو پێویستە بۆ ئەو منداڵانەی دەستکەوتیان نییە لە ژیانیان بکۆڵیتەوە بۆ ئەوەی هۆکارەکەی دیاری بکەیتو چارەسەری بۆ دابنێیت، پاشان یادیان بخەرەوە کە ئەم کارانە تەنها شتێکی ڕەمزییە، لەبەرئەوە پێویستە بە یەکسانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەیت بۆ ئەوەی ئیرەیی لە نێوانیاندا دروست نەبێت، چونکە ئیرەیی بردن سەر دەکێشێت بۆ ناکۆکیو ئاژاوە لە نێوانیاندا لەبری خۆشەویستیو هاریکاری یەکتری.

٤- منداڵەکانت فێر بکە بەباشی بیر بکەنەوە، بۆ نموونە: لەبری ئەوەی سەرکۆنەیان بکەیت لەسەر ئەوەی لە قوتابخانە گەڕاونەتەوەو بەدەستی پیسو چڵکەوە لەسەر خوانی نانخواردن دانیشتوون، دەتوانیت پێیان بڵێیت: وا دیارە ئەمرۆ لە قوتابخانە کاتێکی خۆشتان بەسەر بردووە.

٥- ئەلبومی وێنەکانی تەمەنی منداڵیان بۆ دەربهێنەو نیشانیان بدەو ئەو چیرۆكو ڕووداوانەیان بۆ بگێڕەوە کە پەیوەندی بەکاتی منداڵی ئەوانەوە هەیەو ئەوان بیریان نایەت.

٦- یادی ئەو شتانەیان بخەرەوە کە تۆ لەوانەوە فێربوویت.

٧- پێیان ڕابگەیەنە کە تۆ چەند هەست بە خۆشحالی دەکەیت، چەند بەلاتەوە جوانو نازدارە کە تۆ باوك، یا دایکی ئەوانی.

٨- ڕێگە بە منداڵەکانت بدە کە خۆیان ئەو جلوبەرگانە هەڵبژێرن کەلە بەری دەکەن، بەم کارەشت نیشانی دەدەیت کە چۆن ڕێز لەبیروبۆچوونو بڕیارەکانیان دەگریت.



٩- بەشداری یاریکردنیان بکە، بۆ نموونە وەکو ئەوان دەستەکانت بەڕەنگی جۆراوجۆر پیس بکەو یارییان لەگەڵدا بکە.

١٠- خشتەی منداڵەکانت بزانەو هاوڕێو مامۆستاکانیان بناسە، تاکو کە گەڕانەوە لە قوتابخانە بەشێوەیەکی گشتی پرسیاریان لێ نەکەیت(ئەمرۆ چیتان کردووە) بەڵکو لێیان بپرسە فلان کەس چی کردووە، تۆ چیت کردووە لە قوتابخانە، بەمەش منداڵەکەت هەست دەکات کە تۆ بەباشی ئاگاداری ژیانو گوزەرانیانیو گرنگیان پێدەدەیت.

١١- کاتێك منداڵەکەت داوات لێدەکات قسەی لەگەڵدا بکەیت بەڵام تۆ سەرقاڵی بەشتێکی ترەوە، وەکو دایك کاتێك قسە لەگەڵ منداڵەکەیدا دەکات چێشت لێدەنێت یان سەیری تەلەفزیۆن دەکات یا هەر شتێکی تر، بەڵام لەڕاستیدا دەبێت هەموو تەرکیزت بخەیتە سەر منداڵەکەت کاتێك قسەی لەگەڵدا دەکەیت سەیری چاوەکانی بکە.

١٢- لانی کەم هەفتەی جارێك ژەمە خۆراکێك پێکەوە بخۆن، کاتێك لەگەڵ منداڵەکەت گفتوگۆ دەکەیت تەنها گوێگر مەبە، هەوڵ بدە ڕووداو بەسەرهاتەکانی ڕۆژگار بەتایبەت ڕووداوە نوێیەکانی هەفتەو چیرۆکی بەسوودیان بۆ باس بکە.

١٣- لە نامەیەکی بچووکدا وشەی خۆشەویستیو هاندان یان نوکتەیەکی بەسوود یان ئامۆژگارییان بۆ بنووسە کاتێك تۆ دەڕۆیتە دەرەوەو ئەوان خەوتوون لەسەر جێگەی نووستنەکەیان دایبنێ، یان دەتوانیت بیکەیتە ناو جانتای قوتابخانەکەیانەوە، بەم کارەشت دەیسەلمێنی کە ئەگەر ڕۆژانە لەگەڵیشیاندا نەبیت لە بیریان ناکەیتو هەمیشە لە یادت دان.

١٤- منداڵەکەت بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ گوێبیستی قسەکانی تۆیە، بۆ نموونە: تۆ لە ژوورەکەی خۆت دانیشتووی ئەوانیش سەرقاڵی ئەرکی قوتابخانەیانن لە ژوورەکەی خۆیان لەم کاتەدا بە دەنگی بەرز خۆشەویستیو سەرسوڕمانی خۆتیان بۆ دەربڕە.

١٥- کاتێك منداڵەکانت وێنە دەکێشن، وێنەکانیان لە شوێنێکی تایبەتی ماڵەوەدا بۆ دابنێ، بەشێوەیەك کە ئەوان هەست بکەن تۆ گرنگییان پێدەدەیت.

١٦- لەگەڵ منداڵەکانت بەهەمان ئەو شێوەیە هەڵسوکەوت مەکە کە دایكو باوکت هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا کردوویت، چونکە ئەو جۆرە هەڵسوکەوتە دەتخاتە هەڵەی ڕووخێنەرەوە لە دەروونی منداڵەکەتدا.

١٧- ئەگەر منداڵەکەت کارێکی هەڵەی کرد ڕاستەوخۆ پێی مەڵێ بۆ ئەو هەڵەیەت کردووە، بەڵکو دەتوانیت زۆر بەهێمنی پێی بڵێی: بۆچی بەو شێوەیە کارەکەت ئەنجام نەدا سەرکەوتوو دەبوویت.

١٨- وشەیەکی نهێنی یان نیشانەیەك دابنێ بۆ دەربڕینی سۆزو خۆشەویستی بۆ منداڵەکەت، کە جگە لە خۆتان کەس لەمەبەستی ئەو وشەیە تێنەگات.

١٩- هەوڵ بدە ڕۆژێکی نوێ دەست پێبکەیت، هەموو ڕۆژێك کە خۆر هەڵدێت هەڵەکانی ڕابردوو لە یاد بکە، هەموو ڕۆژێکی نوێ، هەڵگری هەلێکی نوێیە، بەمەش دەتوانیت خۆشەویستیت لە دڵی منداڵەکەتدا زیاد بکەیت، هەروەها یارمەتیت دەدات بۆ دۆزینەوەی تواناو لێهاتوویی منداڵەکەت.

٢٠- هەموو ڕۆژێك منداڵەکەت لە ئامێز بگرەو ماچی بکەو پێی بڵێ: خۆشم دەوێیت، هەرچەندە ئەم کارەت زۆر دووبارە بکەیتەوە ئەوان زیاتر پێویستییان پێیەتی، با تەمەنیشیان زیاد بکاتو گەورەبن ئەو کات زیاتر پێویستیانە، تەنانەت ئەگەر چوونە ژیانی هاوسەریشەوەو نەوەشیان هەبێت، هەر پێویستیان بەم ڕەفتارە نایابەیە!

# ئەگەر منداڵەکەت خەتی ناخۆشە!



م. خالید إبراهیم - قوتابخانەی پشدەری خوێندنی خێرا

خەتی جوان و خۆش هۆکارێکی کاریگەرە بۆ وەرگرتن و گەیاندنی زانیاری، هەندێکمان لەسەرەتای چوونە قوتابخانەو فێربونی نووسیندا یادەوەری خۆشمان هەیە بەهۆی ئەوەی کەهەر لەسەرەتاوە توانیومانە بەجوانی بنوسین، بەڵام بۆ بەشێکی ترمان یادەوەرییەکان ناخۆشن تەنانەت بەهۆی بێ توانایمان لەنووسیندا، قوتابخانە بەلامانەوە شوێنێکی بێتام و وزە روخێنەر بووە.

ئەگەرمنداڵ یان قوتابییەکەت خەتی ناخۆشەو بۆ ئەوەی فێری جوان نووسین ببن ئەوا ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکە:

★ یەکەم هەنگاو پێویستە پشکنینێکی ووردی جەستەیی و فسیۆلۆژی و تواناى پەنجەکان و مەچەك و بازووی منداڵ بکرێت، بۆئەوەی دڵنیابین لەتەندروست بوونی کە ئایا منداڵەکەمان توانای جەستەیی و ماسوولکەیی تەواوە؟ یاخود کێشەی هەیە؟

★ پێویستە هە مووجۆرە ترس و دڵەڕاوکێ و فشار لەسەر منداڵەکە لابەرین و لێی دووربخەینەوە.

★ ئەرکی قوتابخانە دەبێت شیرین و سەرنج ڕاکێش بن بۆمنداڵ.

★ پێویستە ئەو پێنووسەی کەدەیدەینە دەست منداڵەکەمان نەزۆر کورت و نە زۆر درێژ بێت.

★ تابتوانرێت پێنووسی منداڵ یەك جۆربێت بۆ ئەوەی بەکارهێنانی ئاسان بێت و زوو ڕابێت لەگەڵیدا.

★ ئەوکاغەزو لاپەڕانەی کەمنداڵەکەمان بەکاری دەهێنێت دەبێت سپی و ئاسایی بن و نابێت ڕەنگی کایی و کاغەزی چەورو بریقەدارو شەپۆڵدار بن.

★ لەسەرەتای فێربوونی نووسیندا بۆ منداڵ بەهیچ جۆرێك نابێت کاغەزی سپی سادەو بێ خەت بەکاربهێنرێت.

★دەبێت لەقوتابخانەشدا تەختە ڕەشێك بەکار بهێنرێت کە هێڵکاری کرابێت تەنانەت بۆ قۆناغەکانی سەرووش.

★ لەوقوتابخانەی کە بۆردی سپی (وایت بۆرد) بەکاردەهێنن ماجیکەکەیان (پێنوس) بەئەندازەیەك (بچوك) بێت کە گونجاوبێت بۆ پەنجەکانی منداڵ.

★ لە قۆناغی سەرەتادا دەبێت نووکی (ماجیك)و پێنووسی منداڵ لەجۆری خڕبێت نەك پان و لار.

★ پێویستە مامۆستایانی پێش قوتابخانەو پۆلی یەکەمی بنەڕەتی شێوەی گرتنی پێنووسی منداڵ بەوردی چاودێری بکەن، هەروەها پێویستە پێنوس بکەوێتە نێوان پەنجە گەورەو شادەو ناوەڕاست، سەری پەنجەکانیشی زۆر لەنووکی پێنوس نزیك نەبێت و بەشی دواوەشی نەگیرێت.

★ بۆ بەهێزکردن و کشان و هاتنەوە یەکی ماسوولکەکانی پەنجەی منداڵ دەتوانین دەنکەکانی تەسبیحێك لەسەر زەوی بڵاو بکەین و داوا لەمنداڵەکەمان بکەین کە مووروەکان بەهەرسێ پەنجەی گەورەو شادەو ناوەڕاست یەك یەك کۆ بکاتەوە.

★ لەهەوادا نوسین (نوسین بە پێنووس لەسەر هەواو فەزای دەورو بەر) ڕاهێنانێکی بەسوودە بۆ خێرا نووسین، چونکە ئەو کارە بۆ هەماهەنگ کردنی مێشك و چاو لەگەڵ پەنجەکانداو کاریگەری باشی دەبێت بۆسەر خێرا کردنی ماسوولکەکانی دەست.

★ نێوان و گۆشەی بینینی قوتابیان تاکو دەفتەر هەمیشە کۆ نترۆڵ بکرێت.

★ پێویستە زیاتر چالاکی نووسینی منداڵی خەت ناخۆش لەناو منداڵان و هاو پۆلەکانی خۆی ئەنجام بدرێت، تاکو هەستی کێبڕکێی لا دروست ببێت و هان بدرێت و باوەری بەخۆی بەهێز ببێت.

★ وێنەکێشان و ڕەنگ کردنی وێنەکان بەشێوەی ستونی و ئاسۆی و لار ڕۆڵی کاریگەر دەگێڕن لەخێرا نووسینی منداڵ.

★ ناوە ناوە لەپۆ لەکاندا پێشبڕکێی خێرا نووسین لەناو قوتابیاندا ئەنجام بدرێت کارێکی باشە، تاکو ئەو جۆرە منداڵانە چالاکی بنوێنن.

★ هەر ڕۆژەو پێنج خولەك پەنجەی منداڵەکە پێش نووسین بشێلەو بیکەرەوەو دایخەرەوە.

★ بەردەوام هاندان و دەست خۆشی منداڵەکەت بۆ خێرا نووسین و جوان نووسین لەبیر بێت.

★ ئەر کی ئەو جۆرە منداڵانە واباشە کەم بێت، توانایان لەبەر چاو بگیرێت.

★ بەهۆی زوو ماندوو بوونیان ئەو جۆرە منداڵانە پێویستە چالاکیەکەیان بۆبکرێت بە چەند بەشێکەوە.

★ بە ئەزمونکردن ئەوە سەلمێنراوە کە ئەنجامدانی ئەو یاریانەی کە جوڵەی خێراو زۆریان تێدایە کاریگەری هەیە بۆ سەر خێرا نووسینی منداڵ.

★زۆرجار لەو منداڵانەدا ئەوە تێبینی کراوە کە پێنووسەکەیان زۆر بە توندی بە پەنجەکانیان دەگرن، تا ئاستێك کە دەستیان ئارەقە دەکات، بۆیە واچاکە دایك و باوك و مامۆستایان ئاگایان لەوە بێت کە منداڵ زۆ ر بەتوندی پێنوسەکەیان نەگرن و ڕێنماییان پێبدەن، شایانی وەبیر هێنانەوەیە کە ئەو منداڵانەی پێنووس بەتوندی دەگرن توشی ترس و دڵەڕاوکێ بوون.

سەرچاوە/ ماهنامە[ راە موفقیت] ژمارە (٥).

# توڕەبوون و منداڵ

توڕەیی بە یەکێك لە هەستەکانی تری مرۆڤ هەژمار دەکرێت و دەگۆڕێت بەشێوەیەکی ڕێژەیی لە نزمەوە بۆ بەرز و هەندێك جار بە پێچەوانەشەوە دەبێتە گۆڕانێکی فیسیۆلۆژی و بایلۆژی لە لەشی مرۆڤدا.

بەشێوەیەکی گشتی توڕەبوون:- لە ئەنجامی هۆکاری دەرەکی و ناوەکی یاخود کاری هەڵەو نەشیاو ڕوودەدات، کەدواتر مرۆڤ پەلکێش دەکات بەرەو بازنەی توڕەبوون، بگرە گەلێ جار لە ناو کۆمەڵگەو خێزاندا درك بە ڕەنگ و ڕوخسارو هەڵسوکەوتی دەکرێت، لەیەکەمین قۆناغەوە تادوایین قۆناغ دەبینین لەناو خێزاندا کاتێك منداڵ دێتە دونیاوە ئەم منداڵە یەکەمین منداڵی خێزانەو لە سۆزی باوەشی دایەو بابەدایەو هەموو نازێکی پێدەبەخشرێ تا پێگرتن، دواتر لەگەڵ لەدایکبوونی منداڵی دووەم منداڵی یەکەم بەرەو ئاراستەی توڕەیی و شەڕانگێزی هەنگاو دەنێت، چونکە ئەم واهەست دەکات ئەمڕۆ نازو سۆزەکان بەخشراون بە کەسێکی دی.

جۆنلۆك دەڵێت: هۆکارە ژینگەییەکان و بۆماوەییەکان کاریگەریان هەیە لەسەر منداڵ، ئەگەر بروانینە سەر بۆچوونەکانی فەیلەسوفان و بیرمەندانی دەرونزانی و لە لایەك و بیرو باوەری ئاینی ئیسلامیش هەریەکەیان بەشێوەی چەمك و واتای خۆیان وشەی توڕەبوونیان ڕاڤە کردووە.

زانایانی ئاینی دەڵێن: دەستنوێژ گرتن تووڕەبوون ناهێڵێت، تووڕەیی ئاگرەو بە ئاو سارد دەبێتەوە.

جان جاك ڕۆسۆ خاوەن وتەیەکی دەرونزانی و خاوەن فەلسەفەیەکی گەورەیە، لە فەلسەفەی سروشدا دەڵێت: هەموو منداڵێك کە لەدایك دەبێت، خێرەومەندە واتە چاکە خوازە، تۆوی شەڕانگێزی و توڕەبوونی تێدا نییە، بەڵام کۆمەڵگەو ژینگەو دەورو بەر دەیکەن بە منداڵێکی شەڕانگێزو توڕە، هەروەها دەڵێت: با منداڵ لە سروشتدا پەروەردە بێت داوا دەکات باوکان و دایکان سزای منداڵ نەدەن لەکاتی کردنی هەر هەڵەیەکدا کاتێك منداڵ نزیکی ئاگر دەکەوێ با دەستی بسوتێ تاوەکو جارێکی تر ئاگر بناسێ و نزیکی نەکەوێتەوە، دەڵێت: لە منداڵ بگەڕێن با بە ئاو جوان خۆی تەربکات، جلوبەرگەکانی تەر بکات تا ئەوکات هەست بەسەرمادەکات جارێکی تر پەند وەردەگرێت، هەرچەندە ئەم بیرۆکەیەی بوو بە هۆی ڕەخنە لێگرتن و تێبینی و سەرنجی زۆر لە کەسایەتییە دەرونزانەکان، بەرادەیەك زۆرێك لە ئافرەتان منداڵەکانیان لە دەستدا، چونکە دایك منداڵەکەی نەدەبرد بۆ نەخۆشخانە یاخود بیگۆڕێ، ئەمەش دەبووە هۆی نەخۆشکەوتنی منداڵەکە.

ئەگەر بروانینە نووسینەکانی (ئیریك ئێریکسۆن) لە میتۆلۆجیای یۆنانیدا دەڵێت: خواوەندەکانی جەنگ و شەڕانگێزو توڕە یەکێك بوون لە خواوەندەکانی تر تەنانەت (ژڤیس- ئاریس) بەخوێنڕێژترین و بێ بەزەییترین خواوەند ناوزەن کراون، تەنانەت کاتێك ژڤیس ژانە سەرێکی سەخت دەیگرێت داوا لە ئاسنگەرەکەی دەکات بە تەورەکەی کەلەی شەق بکات، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات بەدەر لە هاتنی ئاینی ئیسلام توندوتیژی و توڕەیی لەئارادا هەبووە، بیرمەندانی دەرونزانیش نکۆلی لەوە ناکەن کە پاشماوەی ئەو شەڕانگێزی و توڕەییە هی ئەوکاتەیە کە تا ئێستاش هەر شوێنەواری ماوە، بەرادەیەك مێژوونووسان دەڵێن: هۆکاری جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم لە دەرەنجامی توڕەیی و شەڕانگێزی ڕوویداوە، هەر ئەمەش وایکرد کە ئیتر لەمەولا مافی مرۆڤ پارێزراو بێت، بە پێی مادەی (١٩،٣٨) ڕێکەوتننامەی مافەکانی منداڵ لای کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان پەسەند بکرێت، بەپێی ئەم پەیماننامەیە منداڵ لەخوار تەمەنی پانزەساڵی نابێت لە شەڕدا بەشداری بکات، بیرمان نەچێت توڕەبوون هەردوو لایەنی باش و خراپی هەیە، باشەکەی لە ئەنجامی وریابوونەوەو دووبارەنەکردنەوەی هەڵەیە، هەندێ لە پزیشکانی دەروونی: هەڵڕشتنی ئەو توڕەییە بە تەندروستێکی باشتر دەزانن لەوەی یەکێك توڕەبووەکانی بەناخدا پەنگ بخواتەوە ئەمان بۆچوونیان وایە ئەو کاتە مرۆڤ توڕەیە لە بەرامبەر کەسی ڕووبەرووی پاش دەربرینی تووڕەیی ئاسوودەیی دەبەخشێتە گیانی، هەندێ جار خۆ توڕەکردن چەکێکە بەدەس کەسەکەوە تا بەرامبەرەکەی پێ بترسێنێ، ئەمە لای گەورەیەك بەڵام لای منداڵێك ڕەنگە ئەم تووڕە بوونە بۆبەدەستهێنانی ئامانجێك بێت تا بە ناچاری داخوازییەکەی جێبەجێ بکات.

لەبواری خراپەدا تووڕەبوون لەکۆنترۆڵی مرۆڤەوە دەردەچێ و هەستێکی شکێنەرو ڕووخێنەر بۆکەسی بەرامبەر بەتایبەتی ئەگەر شوێنەکە نەشیاوبوو جێگەی ئەو تووڕەبوونە نەبوو دەرئەنجام زیانێکی گەورەی دەروونی لای کەسەکە جێدەهێڵێت،

تووڕەبوون دەبێتە هۆی:-

- ★ سەرئێشەو شەقیقەی زۆر.
- ★ گاریگەری دەبێت بۆ پێست.
- ★ کەمبوونەوەی بەرگری لەش.
- ★ کاردەکاتە سەر برینی گەدەو دوانزەگرێ.
- ★ هەوکردنی کۆڵۆن.
- ★ بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.
- ★ زیاد بوونی لێدانی دڵ.
- ★ بەرزبوونەوەی ئاستی چەوری (کۆلسترۆڵ).

کەسی توڕەبوو چۆن دەناسرێتەوە:

١- دەمارەکانی مێشك بەتایبەتی ناوچەوان ڕوولەگرژبوون دەکەن.

٢- چاوەکان سووردەبن، یان بەرەو ڕووگرژی و مۆنی هەنگاو دەنێن.

٣- خەندەو بزەکان نامێنن لەشوێنی ئەوان تووڕەبوون جێگای دەگرێتەوە.

٤- هەناسە دان زیاد دەکات.

٥- مرۆڤ تەنها بیر لەشەڕانگێزی و جەنگ دەکاتەوەو هۆشی لای خۆی نامێنێت.

٦- کەسی تووڕەو شەڕانگێز بەئاستی کۆمەڵایەتی نزم سەیردەکرێت.

★ ئایا دەزگاکانی ڕاگەیاندن دەبنە هاندەرو هۆکار بۆ توڕەبوون؟

لە وەڵامدا دەڵێین: بێگومان ڕاگەیاندنیش بەپێی ئەو پێگەی هەیەتی دەتوانێت ڕۆڵ ببینێ لە هەردوو ڕوانگەی (سلبی و ئیجابی)، بابەتە پەروەردەیی و دەرونی و زانستی و تەندروستییەکان جێگەی گەشبینی و ئومێدن، بەڵام نەبوونی لە بەرچاوگرتنی کات و دەرفەت بەداخەوە وای لێکردووە بەرەو ئاراستەی نێگەتیڤانە پەل بکێشێت، بەتایبەتیش سەنتەرەکانی (سی دی) فرۆشتن هەر لێگەڕێ لەکاتێکدا ئەفلام کارتۆنی منداڵەکانیشیان سەرەتا پروپاگەندەیان بە فلیمێکی جەنگی دەست پێدەکات، کەناڵەکانی تەلەفزیۆنی ناوخۆو کەناڵەکانی ئاسمانیش هەر لە ئێوارەی پەخشکردنی بەرنامەکانیاندا ریکلامی مادەی شەو نمایش دەکەن کە پڕە لە شەڕو جەنگ، منداڵیش بە بینینی ریکلام و پروپاگەندەی ئەم دیمەنی فلیمانە ئامادەیە زۆرێك لە کاتەکانی خۆی تەرخانبکات تا (١٢)ی شەو دابنیشێ!

★دەرفەت و هەلی باش تا چەند پێویستە برەخسێندرێت سەبری ئەیوبی بوێ؟

ڕاستە منداڵ لەو قۆناغە ناسکەی کە تێیدا



كامەران محمد ئەمین

دەڕۆی دەیەوێت سەركەوتن بەدەست بێنێ، شتێكی نامۆش نییە كە بیەوێت هەموو بوارەكانی ژیانیش تاقی بكاتەوە تا شتەكانی چواردەوری خۆی بناسێ و كەسایەتی خۆی وەك كەسێكی گەورەتر لەخۆی نمایش بكات، پاڵەوان ئاسا سەربەخۆیی خۆی رابگەیەنێ، بۆیە ئاساییە منداڵ لەكاتی تورەبووندا كەلوپەلەكانی ماڵ تێكبشكێنێ و تێكیان بداو ماڵ جێبهێڵێ و بۆ ماوەیەك بە گۆشەگیری دوورەپەرێزی رەفتار بكات، دەڵێن ئەمانەش بەپێی خێزان دەگۆرێت، هەندێك خێزان لە بوونی ئەم رەفتارەی منداڵ رەنگە نازو بابەگیانو دایە گیان وەڵام گەل بێت، رەنگە لای هەندێ خێزانی تر شێوەی توندو تیژی لێدانو ئازاردان وەڵام گەل بێت، لێرەوە پرسیارێ دێتە ئاراوە كاتێك خێزانی خاوەن منداڵی بزۆزو جوڵە سەردانی ماڵێك دەكات ترسی ئەوە هەیە كە ئەم منداڵە دوو خێزان نارەحەت بكات، لەم كاتەدا جگە لە شەرمەزاری خێزان هیچی تر چاوەروان ناكرێ.

(مرگریت میت) سەردانی وڵاتی كینیای تازە دەكاتو باسی سێ جۆر رۆشنبیری كۆمەڵگای كرد لەوانە كۆمەڵگای (ئەراپش، مۆندۆ گۆمر، شامبۆلی).

لە كۆمەڵگای (مۆندۆگۆمر)دا پیاو بەتوانایە لە راوشكارو كوشتنو ئارەزووی شەرانگێزییان هەیەو ئافرەتەكانیشیان هەر وەكو پیاوەكانن منداڵەكانیان فێری شەرخوازی دەكەن لەسەرەتای ژیانیاندا مامەڵەی توندو تیژی لەگەڵ منداڵەكانیان دەكەنو بۆ ماوەیەكی دورودرێژ لێیان دەگەرێن كە بگرین، لەبەر ئەوە رەوشتی منداڵەكان لەو هۆزەدا لە كەشو هەوایەكی توندو تیژو شەرانگێزدان، هەر بۆیە منداڵەكان شەرانگێز رەفتار دەكەن.

ئەفلاتون: پێی وابوو دەروون لە سێ بەش پێكدێت (دەروونی ژیری، دەروونی تورە، دەروونی هەوەسبازی، یاخود ئارەزو بازی)، ئەفلاتون پێی وابوو دەروونی تورە مەڵبەندەكەی سنگەو چاكییەكەی ئازاییەو خراپییەكەشی ترسنۆكییەو تایبەتیشە بە جەنگاوەرەكان، فڕ رنینەوە یاخود دەستو قاچ دەرهێنانو چاو دەرهێنانی بووكە شوشەیەك لای منداڵی كچ بریتییە لە پەرچدانەوە (تۆڵە)، لەگەڵ ئەوەی یاری تۆپی پێ هونەرێكی خەم رەوێنەو بە یەكێك لە چالاكییە مرۆییەكانو خاڵیكردنەوەی وزەی منداڵ دادەنرێ لە هەمان كاتیشدا دراندنی تۆپێك بە چەقۆ لای منداڵێكی كور بەرپەرچدانەوەیە (تۆڵە)، كەواتە لێرەوە بۆمان دەردەكەوێت:

هەڵچوونەكان:- بارێكی دەرونین بریتیین: لە هاوبەشیكردنی هۆكارەكانی ژینگەو فەسلەجی لە مرۆڤداو بریتین لە بارودۆخێكی رژاندنی خۆش یان ناخۆش كاتێك تاك هەست بە بوونی هەڵچوون دەكات بێگومان ناتوانێت جەخت لەسەر ئەنجامدانی ئیشو كارەكانی خۆی بكات كە پێی سپێردراوە، زۆرێك لە بیرمەندان دەڵێن: دەربرینی هەڵچوون كاتی دیاریكراوی دەوێت، منداڵی شیرە خۆر كاتێك لەناكاو توشی دەنگێك یان تووشی ئازارێك دەبێت دەگری، ئەو دڵە بچووكەی دەست دەكات بە لێدان بەخێرایی وەڵام دەداتەوە كە دەلالەت لە تورەبوونو هەڵچوون دەكات.

(ولیام جیمس) پێی وابوو هەڵچوون بەهۆی كارتێكردنی ژینگەییەوە دەبێتە گۆرانكاری فەسلەجیو هەندێ جار هەڵچوونەكان گرفتمان بۆ دەنێتەوە.

★ منداڵ بە یەكێك لە قۆناغە گرنگو دەسپێكەكانی چوونە ناو دنیای ژیانو ئاشنابوون ململانێ لە نێوان تورە بوونو ئارامگرتندا چەمكێكی كۆنو نوێیە كە هەندێكیان لە میسۆلۆجیاو مێژوو حیكایەتە ئەفسانەییەكان دەستاو دەست بەجێماون، جا هۆكارەكان سیاسی بێت یان كۆمەڵایەتی یان بۆماوەیی، بۆتە رووداوو پێگەیەكی لە ژیانی ئەمرۆ داگیر كردووە.

# پێڵاوەکانی میری میهرەبان

ع.ش.شێرکۆ



لە گوندێکی بچکۆلەدا دەژیان، خەڵکی گوند زۆر مرۆڤی چاك بوون، یەکتریان زۆر خۆشدەویستو بەهێزەکان یارمەتی بێ هێزەکانیان دەداو بەزەییان پێیاندا دەهاتەوە!

هەموویان هاوکاری یەکتریان دەکرد بۆ ئەوەی گوندەکەیان جوانترینو رازاوەترین گوندی ناوچەکە بێت، دانیشتووانی ئەم گوندە زۆر دڵسافو میهرەبانو مرۆڤ دۆست بوون، بەڵام لەو پەری هەژاریو دەست کورتیدا دەژیان، هەموویان پێیەکانیان پەتی بوو! بەپێ خاوس بەسەر زەویدا دەرۆیشتنو هیچ کام لەوان جووتێ پێڵاوی نەبوو کە پێیەکانی بپارێزێت لە بەردەڵانو درکو داڵی رێگا!!

تەنها کەسێك لە ناو ئەواندا جووتێك پێڵاوی هەبێت میری گوند بوو!

رۆژێك لە رۆژەکانی بەهار میر تەشریفی بردە دەرەوەی گوندو کۆمەڵە جووتیارێکی بینی خەریکی زەوی کێڵانو بەردو درکی زەوییەکە پێیەکانیانی بریندار کردووەو شوێنەواری ئەو کارە بە ئاشکرا بە پێیەکانیانەوە دیارە!

میر زۆر نیگەران بوو بەم دیمەنەو پێڵاوەکانی خۆی داکەندو دای بە جوتیارەکانو پێی گوتن: (ئەگەر بە نۆرە پێڵاوەکەتان لە پێ کرد، دەتوانن باشتر زەوییەکە بکێڵنو پێیەکانیشتان ئازاری نابێت).

ئەوانیش گوتیان: سوپاس بۆ تۆ ئەی میری میهرەبان، بەڵام ئەی تۆ چی دەکەیت؟ ئایا وەکو ئێمە بە پێخاوسی دەرۆی بە رێدا؟!

میرگوتی: (نا نیگەران مەبن هەوڵدەدەم بەسەر گژوگیای نەرمدا برۆم).

جوتیارەکان پێڵاوەکانیان وەرگرت، دوا بە دوای یەك بە نۆرە لە پێیان دەکرد، هەرجارەی یەکێکیان بۆ کێڵانی زەوییە رەقەڵانەکە لە پێی دەکرد، دوای چەند هەفتەیەك زەوییەکە نەرمو خاوێن بووەوەو هیچ بەردو کەستەکێکی رەقی تێدا نەماو ئامادە بوو بۆ تۆو کردن.

جوتیارەکان بەم کارە زۆر دڵخۆشبوون، یەکێك لە جوتیارەکانیان نارد تا پێڵاوەکە بگێڕێتەوە بۆ میرو سوپاسی بکات.

لە رێگا چاوی بە کۆمەڵێك ئافرەت کەوت کە چیلکەو داری چکۆلە کۆدەکەنەوە.

ئەویش پرسیاری لێکردن: بۆچی ناچن بۆ دارستانو داری زۆر گەورە بهێنن؟!

ئافرەتەکان لە وەڵامدا گوتیان: ناتوانین چونکە درکو داڵی دارستان پێیەکانمان بریندار دەکاتو ئازارمان دەدات.

جوتیارەکە پێڵاوەکانی میری پێدانو پێی گوتن: (ئەگەر لە ناوخۆتاندا بە نۆرە ئەم پێڵاوەتان لە پێکرد ئەوا هەر یەکێك لە ئێوە دەتوانێت بچێت بۆ دارستانو پێی بەسەر درکەکاندا بنێ بێ ئەوەی ئازاری پێ بگات، بەم کارەش دارێکی زۆر کۆدەکەنەوە.

چەند هەفتەیەکی زیاتر نەبرد ئافرەتەکان دارێکی زۆریان لە دارستانەکەدا کۆکردەوەو گواستیانەوە بۆ گوندەکەی خۆیان).

ئافرەتان بەم کارەیان زۆر دڵخۆشبوونو یەکێکیان نارد کە پێڵاوەکە بەرێتەوە بۆ میرو سوپاسی بکات، لە رێگا چاوی بە کۆمەڵێك منداڵ کەوت، کە لە سەبەتەیەکدا کۆمەڵێك میوەی وشكو خراپیان پێ بوو، ئەویش لێی پرسین: ئەم میوە کرچو کاڵو خراپانە چین؟!

منداڵەکان لە وەڵامدا گوتیان: ناتوانین خانم گیان، ناتوانین دارستانەکە پڕی لە درکەو پێیەکانمان ئازار دەداتو خوێنی لێدێنێت.

ئافرەتەکەش پێڵاوەکانی میری پیشان دانو پێی گوتن: (ئەگەر بەنۆرە ئەم پێڵاوەتان لە پێ کرد، ئەوا هەموو یەکێك لە ئێوە دەتوانێت بچێتە ناوەراستی دارستانەکەو میوەی تازەو بەتام لێبکاتەوە، بێ ئەوەی پێیەکانیشی ئازاری پێ بگات.

منداڵەکان زۆر خۆشحاڵ بوونو لە نێو خۆیاندا بە نۆرە هەر جارەی یەکێکیان پێڵاوەکانی لە پێ دەکردو دەچووە نێوەراستی دارستانەکەو میوەی تازەو بە تامی دێنا.

دوای چەند هەفتەیەك میوەیەکی زۆریان کۆکردەوەو ویستیان پێڵاوەکان بە یەکێکیاندا بنێرنەوە بۆ جەنابی میرو سوپاسی بکەن...بەڵام دەزانن چی روویدا؟

پێڵاوەکانی میر دڕابوونو ببوون بە چەند پارچە چەرمێکی کۆنو دڕاو، پێڵاوەکە ئەوەندەی پێوە نەمابوو کە بە کەڵکی ئەوە بێت میر لە پێیان بکات!!

بەڵام گوندەکە پڕ بوو لە بەروبوومو دانەوێڵە، دانیشتووان توانیان بەشی خۆیانی لێ هەڵبگرنو هەندێکیشی لێ بفرۆشنە گوندەکانی دەوروبەریان.

ماڵەکان پڕ بوون لە داری باشو خۆیان ئامادە کردبوو بۆ پێشوازی زستانێکی سارد. ئەوەشی لێیان زیاد بوو فرۆشتیان.

هەروەها منداڵەکانیش توانیان بە شێك لەو میوەیە بفرۆشن کە لە پێویستی خۆیان زیاد بووبوو.

خەڵکی گوند توانیان بە پارەی ئەو بەروبوومو دارو میوەیەی کە فرۆشتبیان سەرو جووت پێڵاوی جوان بۆ هەریەکە لە پیاوانو ژنانو منداڵانی گوند بکرن، وێرای ئەوەی کە جوتێك پێڵاوی زۆر جوانیان کری کە شایەن بێت بە میری میهرەبانیان!!

لە رۆژێك لە رۆژە ساردەکانی زستاندا کە میر پێڵاوە جوانەکانی لە پێدابوون دەستکێشە نەرمەکانی لە دەستدا بوون، چەند کرێکارێك بینی بە بەفرماڵ رێگەکەیان پاك دەکردەوە.

لێیان نزیك بووەوە تەماشای کرد دەستەکانیان شەق شەق بووەو سەرماو بەستەڵەك خەریکە پەنجەکانیان هەڵدەوەرێنێ!

میری میهرەبانیش خێرا دەستکێشەکانی داکەندو دای بە کرێکارەکان....

هەڵبەت هەمووتان دەزانن هەموو دوای ئەوە چی روویدا؟.

ئەم چیرۆکانەی بە ناوی (ع. ش. شێرکۆ)وە بڵاو دەکرێنەوە زۆربەیان بە دەستکارییەوە لە ئەدەبو کلتوری جیهانییەوە وەردەگیرێتو ناوی نوسەرێکی تایبەتیان لەسەر نییەو نووسەرەکانیان نەناسراونو دەچنە خانەی بەرهەمی بیرو کەلتوری مرۆڤایەتی گەلانەوە.



# نامەیەك لە دایكێكی دڵشكاوەوە بۆ كوڕەكەی!

و/ مافناس: هێمن محمد علی

ئەی كوری شیرینم.. ئەمە نامەی دایكە هەژارو كڵۆڵەكەتە... پاش شەرمو دودڵییەكی زۆر دەستم دایە پێنووسەكەم تا لەگەڵت بدوێم.. زۆر جاریش فرمێسك و ئەسرینی چاوو دڵم لە نووسین دەیان وەستاندم...

ئەی كورە شیرینەكەم... دوای تەمەنێكی دوورودرێژ، دەتبینم پیاوێكی تەواوو پێگەیشتووی لە رووی ژیرییەوە... مافی خۆمە ئەم نامەیەم بخوێنیتەوە... ئەگەر ویستیشت لە دوای خوێندنەوەی بیدرێنە، هەروەك دڵت دراندمو پارچە پارچەت كرد... ئەی كوری شیرینم (٢٥) ساڵ پێش ئێستا رۆژێكی پرشنگدار بوو لە ژیانی مندا كاتێك پزیشكەكەم هەواڵی دوو گیانی پێدام.. كورەكەم تەنها دایكان مانای ئەم وشەیە بە باشی دەزانن و هەستی پێدەكەن.. چوون وشەیەكی هیوا بەخش و دڵخۆشكەرە.. سەرەتای ئازارەكانیش لە گۆرانی جەستەمەوە دەستی پێكرد.. لە دوای ئەم هەواڵە خۆشەش (٩) مانگ بە دڵی خۆشەوە لە سكمدا هەڵم گرتی.. بە نارەحەتی هەڵدەستامو بە نارەحەتیش دەخەوتمو بە نارەحەتیش خواردنم دەخواردو هەناسەم دەدا، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا خۆشەویستی و دڵخۆشیم بۆت كەمی نەكرد.. زۆر تاسەم دەكردی كورەكەم، ئازار لە دوای ئازارو ئێش لە دوای ئێش هەڵم گرتی.. كاتێك كێشت زیاد دەبوو زیاتر دڵخۆش دەبووم.. لە كاتێكدا هەڵگرتنت بۆ من نارەحەتتر دەبوو.. ئازارەكان بەردەوام بوو هەتا بەرەبەیانی ئەو شەوەی كە تا سپێدەی بەیانی چاوم لێك نەناو لە ئازارو نارەحەتیەكدا بووم كە قەڵەم ناتوانێت گوزارشی لێ بكات و زمان ناتوانێت لێی بدوێت.. چەندان جار بە چاوەكانم مردنم دەبینی.. هەتا ئەو كاتەی هاتیتە دونیاو فرمێسك و گریان و هاوارت تێكەڵ بە فرمێسكی خۆشیم بوو.. لە خۆشیدا هەموو ئازارو برینەكانم سارێژ بوون و بیرم چوونەوە..

ئەی كوری شیرینم: ساڵانێكی زۆر لە تەمەنت تێپەری و من لە نێو دڵمدا هەڵم گرتی.. بە دەستەكانم دەمشۆردی.. باوەشم كردە جێگەی راكشانت، سنگم كردە ژووانی خواردنت.. شەو نخونیم دەكرد تا تۆ بنوویت.. هیلاكی شەوو رۆژ بووم تا دڵخۆش و كامەران بژیت.. هەموو رۆژێك ئاواتەخواز بووم لە هەموو ساتێكدا زەردەخەنەو خۆشیت ببینم.. دڵخۆشیم هەموو ئەو كاتانە بوو كە داوای شتێكت بكردایەو بۆم جێبەجێ بكردییایە.. رۆژو شەو تێپەرین و خزمەتم كردی بەبێ كەمو كوری.. هەتا بووی بە لاوو شێوەی پیاوەتیت تێدا دەركەوت.. بە راست و چەپدا دەگەرام بە دوای ئەو ئافرەتەدا كە داوات دەكرد.. هەتا كاتی ئاهەنگەكەت هات.. دڵخۆشبووم بە ژیانی نوێت.. دڵتەنگیش بووم بە لێك دابرانت.. بەڵام بەداخەوە نكوڵیت لێكردمو منت بیر چۆوە.. كاتێكی زۆر تێپەریوەو ناتبینم و گوێم لە دەنگت نییە..

ئەی كورە شیرینەكەم.. داوای شتێكی زۆرت لێناكەم.. تەنها لە جێگەی هاورێ دوورەكانت دام بنێ.. بمكە بە یەكێك لە وێستگەكانی ژیانت و هیچ نەبێت با مانگی ئەگەر بۆ چەند خولە كێكیش بێت بتبینم.. كوری شیرینم پشتم چەمیوە.. دەردو نەخۆشی سەردانیان كردوم.. زۆر بەگرانی و زەحمەت دەتوانم دانیشمو هەڵسم.. بەردەوامیش دڵم بە خۆشەویستی تۆوە لێدەدا..

كورەكەم.. ئەگەر رۆژێك كەسێك چاكەیەكی لەگەڵ كردی سوپاس و ستایشی دەكەیت.. خۆ دایكت لە هەموو كەس بۆت باشتر بوو، لە چاكە زیاتر هیچت لێ نەدی.. چەندان ساڵ خزمەتم كردی.. ئەی كوا پەیمان و پاداشت و وەفات.. دڵرەقیت گەیشتۆتە ئەم رادەیە..؟!

كورە شیرینەكەم.. هەر كات بزانم كە تۆ لە ژیاندا دڵخۆش و بەختیاریت..ئەوا كامەرانی رووم تێدەكات بەڵام سەرم سور دەمێنێ كە تۆ پەروەردەی دەستی منی.. چ تاوانێكم كردووە هەتا ببم بە تاوانبارێك و نەتوانی سەیرم بكەیت و سەردانم بكەیت؟!

وەكو ئەو خزمەتكارانە سەیرم بكە كە دوای كارەكانیان كرێیان پێ دەدەیت..لە باتی كرێ كەمێك سۆزو بەزەیتم پێ ببەخشەو چاكبە لەگەڵمدا چونكە خودا چاكە خوازانی خۆش دەوێت..

كوری شیرینم.. لەم كاتەشدا كە دڵ شكاوم و چاوم پڕ فرمێسكە سكاڵام بەرامبەرت نییە.. لەبەرئەوەی ئەگەر سكاڵام هەبێت سكاڵای من بەرزەبێتەوە بۆ سەرو هەموو هەورەكان و بەرەو دەرگاكانی ئاسمان هەنگاو دەنێت و ئەو كاتەش سزاو مەینەتیت بۆ دادەبەزێت.. نەخێر واناكەم.. هەتا ئێستاش كورەكەم پارچەیەكیت لە جگەرم.. رێحانەو گوڵەباخی بۆن خۆشی منی..

كورەكەم دڵنیابە پیری رووت تێدەكات.. پاش چەند ساڵێك دەبیت بە باوك و پاشان پیر دەبیت.. (الجزاء من جنس العمل) ئەم نامەیە باش لەبەر بكە، چونكە بە دڵنیاییەوە بە فرمێسكەكانت بۆ كورەكەتی دەنووسیتەوە هەروەك من بۆم نووسیت..كورەكەم.. لە خودا بترسە.. ئەگەر ویستت دوای خوێندنەوەی، نامەكەم بدرێنەو پارچە پارچەی بكە هەروەك چۆن دڵت پارچە پارچە كردمو دراندت..

دایكت

نەسیم سەمادی
سەرنووسەری (خلاصات - المختار - علاق

# وانەیەك بۆ سەرکردەکان و ئەوانەی لە داهاتوودا دەبنە سەرکردە

تـا ئێسـتاش (یاسـای کێڵگـە) یەکێکـە لە بەهێزترین یاسـاکانی سەرکەوتن کە مرۆڤایەتی ناسـیویەتی، بەڵام وێرای ئـەوەی کە لە هەموو یاسـاکان روونو ئاشـکرا تـرە لەگەڵ ئەوەشـدا پیادەکردنی لە هەموویان ئەستەم ترە!!

دەقی یاسـاکەش بریتییە لـەوەی (کە ئێمە بەردەوام ئەوە دەچنینـەوە کە تۆومان کردووە، ئەوە وەردەگرینەوە کە بەخشیومانە).

ئەم یاسـایەش بەخشین لە کارو پەیوەندییە مرۆییەکانیش دا دەگرێتـەوە، لەبەرئەوەش کە ئەم یاسایە یاسایەکی سروشتییەو لەگەڵ فیترەتی مرۆڤـدا گونجاوە، شـایان بە هەڵوەشـاندنەوەو رەخنە نییەو هەر کەسێك کاری پێبکات پاداشت وەردەگـرێو هەر کەسـێکش سـەرپێچی بکات زەرەرمەند دەبێت.

(سـتیفن کوڤی): ئـەم یاسـایەی گۆڕیوە بە بیردۆزەو راڤەی کردووەو کاریگەرییەکانی لەسەر ژیانی پراکتیکیو کەسی روون کردۆتەوە.

(پاولوکویلیو)ش هەمـان رێگای گرتۆتەبەر لە رۆمانی (سـیمیائی) کـە وەرم گێراوەو کورتم کردۆتەوە لە کتێبی (السبب قبل الذهب)دا.

(پاولوکویلیـو) شـێوازێکی ئەفسـوناویو رۆشـنبیرییەکی بـێ سـنووزی هەیـە، خاوەنی نیگایەکـە کیشـوەرو رۆشـنبیرییەکان دەبڕێت، وێـرای بوێـریو ئازایەتـی لـە راڤـە کـردنو رادەربریندا.

لـە پێشـەکی دوا رۆمانیدا بە نـاوی (یانزە خولەك) ئـەم چیرۆکەم خوێنـدەوە: یەکێك لە داناکان لەسـەرە مەرگدا قوتابییەکی لێی پرسی: مامۆستاکەم کێ فێری کردی؟

ئەویـش لـە وەڵامـدا گوتـی: زۆرن ئـەو مامۆسـتایانەی کە منیان فێرکـرد، یەکێك لەو مامۆسـتایانەش کـە فێریـان کـردم منداڵێـك بـوو، بینیـم مۆمێکـی بەدەسـتەوەیەو بەرەو مزگەوت دەڕوات، لێم پرسـی: خۆت ئەم مۆمەت داگیرساندووە؟

گوتی: بەڵـێ، منیش لەبەرئـەوەی نیگەران بووم لە یاریکردنی منداڵان بە ئاگر لێم پرسـی: گوێم لێ بگرە منداڵەکە، کاتێك مۆمەکە خامۆش بـوو، دەتوانی پێم بڵێی ئەو ئاگرە لە کوێوە هات بۆ داگیرساندنی؟

منداڵەکـە پێکەنیو مۆمەکـەی کوژاندەوەو لێی پرسـیم: ئایـا تۆش دەتوانی پێـم بڵێی ئەو ئاگرەی مۆمەکەی داگیرساندبوو بۆ کوێ چوو؟

(پاولوکویلیو) لای وایە گڕی دانایی لە ناخی مرۆڤەوە دادەگیرسێ، کاتێك دەبینە خاوەنی ئەو گرە، دەتوانین هەر کاتێك پێویستمان پێی هەبێت دای گیرسێنین!!

منیش وا دەبینـم کە دانایی لە ناخماندایەو هەرگیـز ناکوژێتەوە، خەڵکی بـە چاوی خۆیان ببیبینـن یا نا، ئەو داناییـەش کاری خۆی دەکات بەو مەرجـەی ببینـە خاوەنیو بیبەخشـینو خامۆشی نەکەین!

هاورێیەکیشـم گازنـدەی ئـەوەی دەکرد کە زۆربـەی بریـنداریو پێکانەکانـی لە دەسـتی راسـتیدان، منیـش پێم گـوت: بۆچـی گازندە دەکەیت؟ ئەو دەسـتەی زێتر بە کاری دەهێنیت، زیاتر بریندار دەبێتو تووش دەبێت!

دەسـتی چەپت بەکاربهێنە تا ئەویش زیاتر بریندار بێتو بەهێز بێت!

بریندار بوونو پێکان بە شـێکە لە کار، ئەو نرخەیە دەبێت بیبەخشین لە پێناو سەرکەوتنو ناوازەیی لە کارەکانماندا!

لەبەرئـەوە هیچ گرفتێك نابینم شـایان بە سکاڵاو گازندە بێت!

سـکاڵاش بەشـێکە لـە کار، گرنـگ ئەوەیە گازندەمان هەبێت، بەڵام وەکو جووتیارەکان کار بکەین! تـۆو بکەینو هەموو توانامـان بخەینە کارو چاوەڕوانی خەرمان بین!